


له بڵاوكراوەكانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی (٣٩)



# هەژموونی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات
# له دیدی رۆژهەڵاتناسانەوە

دیاری خالید مارف

هەژموونی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات لە دیدی رۆژهەڵاتناسانەوە
دیاری خالید مارف



گەلی كورد بێبەش نییە لە نیگای رۆژهەڵاتناسان و كوردناسان، بەو پێیەی بۆچوون و نووسراویان دەربارەی كورد خستووەتە ڕوو، بەڵام تا ئێستا وەك پێویست كاری بۆ نەكراوە، وەك ئەوەی هەندێك لە نووسەران و توێژەران كار و نووسراوی رۆژهەڵاتی رەتدەكەنەوە، یاخود لای هەندێكی دیكە نووسراو و پەڕتووكەكانیان وەك سەرچاوەی سەرەكی وەردەگیرێن و لایان قبوڵە، بەڵام لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەدا پێویستە كارەكانیان تەتەڵە و شەنووكەو بكرێن، دواتر بڕیاریان لەبارەوە بدرێت.



# هەژموونی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات
# لە دیدی رۆژهەڵاتناسانەوە

.........................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٣٩)


- نووسینی: دیاری خالید مارف
- بابەت: توێژینەوەی مێژوو
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپی یەکەم: چاپخانەی سڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٢٨٩)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

# پێڕست



## بەشی یەکەم

## سەرەتایەك بۆ چەمك و مێژووی رۆژهەڵاتناسی

## بەشی دووەم

## هەژموونی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەلات، لە دیدی رۆژهەلاتناسانەوە:



## بەشی سێیەم

## وێنای ئیسلام لە دیدی رۆژهەلاتناسانەوە

## بەشی چوارەم

## پێویستیی زانستی ڕۆژئاواناسی، هەنگاوێك بۆ دەربازبوون لە هەژموونی ڕۆژئاوا

## پێشکەشە بە

ـ دایکم، دڵپاکی و میهرەبانیەکەی زیانی پێگەیاندووە.

***

ـ مامۆستا و دۆستی ئەزیزم، عەبدولکەریم فەتاح

پیاوێك بە تەنیا لەوپەڕی شارەوە نەمام دەچێنێت.

***

ـ هاوڕێیانم، سەروەتێکی مەعنەویین.

**هەستی پێزانین و سوپاسم بۆ:**

- هاوڕێی ئازیزم، کاوە شێخ عەبدوڵڵا، ئەرکی نەشخەسازی و خوێندنەوەی بەشێکی زۆری نووسینەکەی گرتە ئەستۆ.

- هاوڕێیانم (خوبەیب نادر، هێمن عەلی، هاوڕێ کەریمی، نەبەرد محەممەد عەلی و کارا فاتیح) بۆ پێداچوونەوە و هاوکارییکردنم.

- بۆ ئەو خوێنەر و هاوڕێ بەڕێزانەم پێشنیاز و بۆچوونیان لەبارەی ئەم نووسینەوە دەربڕیوە.

# پێشەکی

قسە و گفتۆگۆکردن لەسەر ڕۆژهەڵاتناسی، بۆچوونی جیاوازی لێکەوتووەتەوە، بەو پێیەی زۆرینەی ڕۆژئاواییەکان وەك زانست لێی دەڕوانن، زۆرێکیش لە ڕۆژهەڵاتییەکان ڕەتیدەکەنەوە، ڕۆژئاواییەکان لەبەر ئەوە ڕۆژهەڵاتناسی بە زانست دادەنێن، چونکە پێیانوایە توێژەرە ڕۆژئاواییەکان توێژینەوەیان بەشێوەی زانستی ئەنجام داوە.

ڕۆژهەڵاتیەکانیش باس لەوە دەکەن، ڕۆژئاواییەکان بێلایەن نەبوون لە کارەکانیاندا، بەتایبەت بەرانبەر ئاییینی ئیسلام، وەك هەندێك نووسەر و ڕووناکبیری ڕۆژهەڵاتی، ڕۆژهەڵاتناسان بە پاڵنەر و بزوێنەری داگیرکەران و کۆلۆنیاڵەکان دەزانن، تەنانەت هەندێك نووسەر و توێژەری ئیسلام، ڕۆژهەڵاتناسان بە دۆستی شەیتان و خراپەکار ناودەهێنن، لەهەمانکاتدا کۆمەڵێك نووسەر و توێژەری دیکەی ڕۆژهەڵات، ڕۆژهەڵاتناسان وەك فریادڕەس و ڕزگارکەری دۆکیۆمێنتەکان و بەڵگەنامە و دەستنووسە کۆنەکان دادەنێن.

پێویستە لەم نێوانەدا بۆچوونێکی دیکە بەشێوەی زانستی بخرێتەڕوو، کە هەڵسەنگاندن بۆ کارەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بکات و خوێنەر بەهەڵەدا نەبرێت. سەرەڕای ئەوە، ئەم جۆرە بابەتانە گرنگییەکی زۆریان بۆ کورد دەبێت، چونکە گەلی کورد بێبەش نییە لە نیگای ڕۆژهەڵاتناسان و کوردناسان، بەو پێیەی بۆچوون و نووسراویان

دەربارەی کورد خستووەتە ڕوو، بەڵام تائێستا وەك پێویست کاری بۆ نەکراوە، وەك ئەوەی هەندێك لە نووسەران و توێژەران، کار و نووسراوی ڕۆژهەڵاتی ڕەتدەکەنەوە، یاخود لای هەندێکی دیکە نووسراو و پەڕتووکەکانیان وەك سەرچاوەی سەرەکی وەردەگیرێن‌و لایان قبوڵە، بەڵام لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەدا پێویستە کارەکانیان تەتەڵە و شەنووکەو بکرێن، دواتر بڕیاریان لەبارەوە بدرێت.

کتێبی ((*هەژموونی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵات، لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسانەوە*)) لە چوار بەش پێکدێت:

بەشی یەکەم بەناوی (*سەرەتایەك بۆ چەمك و مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی*) کە تێیدا بە کورتی باس لە: زاراوە، پێناسە، مێژوو، جیوگرافیا و دامەزراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسی کراوە.

بەشی دووەم (*هەژموونی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵاتەوە لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسانەوە*)، لەم بەشەدا، باس لە خۆپەسەندی و ڕۆحی باڵایی ڕۆژئاوا بەسەر ڕۆژهەڵاتەوە دەکرێت، دیارە ئەمە مێژوویەکی قووڵی هەیە، بە جۆرێك بۆ سەردەمی یۆنانەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام جارێکی دیکە لە چەند سەدەی ڕابردوودا ڕۆژهەڵاتناسان ئەمەیان زیاتر قووڵکردەوە.

هەرچی بەشی سێیەمە بە ناونیشانی (***وێنای ئیسلام لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسانەوە***) باس لە بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان لەبارەی ئیسلامەوە لەم بەشەدا دەکرێت، ئەویش بە گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی هاتنی ئیسلام، بەو پێیەی هەر لەو سەردەمەوە قسەیان لەبارەی

ئیسلامەوە کردووە، دیارە لەئێستاشدا کە لە سەدەی (٢١)دا ژیان دەگوزەرێت، ئەو وێنایانەی ڕۆژهەڵاتناسان بۆ ئیسلامیان دروستکردووە کاری لەسەر دەکرێت.

کۆتا بەش کە بەشی چوارەمە (*پێویستی زانستی ڕۆژئاواناسی، هەنگاوێك بۆ دەربازبوون لە هەژموونی ڕۆژئاوا*) باس لەو هەنگاوانە دەکەن کە دەتوانرێت ئەو هەژموونەی ڕۆژهەڵاتناسان و فەیلەسووفانی ڕۆژئاوا دروستیانکردووە، تێپەڕێنن و خاوەنی بڕیار و بۆچوونی ڕۆژهەڵاتیانە بن.

بۆ ئەم توێژینەوە چەندین سەرچاوەی کوردی، ئینگلیزی و فارسی سوودی لێبینراوە، بەڵام زیاتر پشت بە چەند پەرتووکێکی ئینگلیزی بەستراوە کە لێرەدا بە کوردی ناوەکانیان دەنووسین، پەرتوکی (ڕۆژهەڵاتناسی) ئەی ئێلْ ماکفی، پەرتووکی (مێژوو و سیاسەتی ڕۆژهەڵاتناسی) زەچاری لۆکمان، هەروەها کتێبێکی دیکە بەناوی (ڕۆژهەڵاتناسی) لە نووسینی زیائەدین سەرداربەست، هەروەها پەرتووکی (سیر تاریخی و ارزیابی شرق اندیشه شناسی) لە نووسینی دکتۆر محمد دسوقی، کە لە زمانی فارسیوە سوودی لێوەرگیراوە، هەروەها دوو بەرگی (مانیفستۆی شارستانی دیموکراتی) عەبدوڵڵا ئۆج ئالان، بە ناوەکانی (قەیرانی شارستانی لە خۆرهەڵاتی ناوین و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی) و (مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراسی شارستانی سەرمایەداری) سوودی لێبینراوە، یەکێکی دیکە لەو سەرچاوانەی زۆر بەکارهێنراوە کتێبەکەی ابو الحسن علي الحسني

الندوي، بەناوی (بە داڕووخانی موسڵمانان، جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!) هەروەها بەرگی یەکەمی (غەمە جڤاتیەکان)ی فاروق رەفیق لە چەند بەشێکی ئەم پەرتووکەدا زیاد لە جارێك ئاماژەی بۆ کراوە.

هەرچەندە تەنیا ئەم سەرچاوانە و چەندین سەرچاوەی دیکە بەس نین بۆ ئەوەی نووسینێك لەبارەی رۆژهەڵاتناسیەوە بنووسرێت، نەخاسمە لەسەر مێژوو و ریشەی ناکۆکییەکانی هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بێت، ئەمە ئاریشە و کێشەیەکی سەرەکی بوو، بۆیە بەناچاری هەندێك پەرتوك، لەچەند بەشێك چەندین جار بەکارهێنراوە، دیارە بەشێکی پەیوەندی بە نەبوونی سەرچاوەی کوردیەوە هەیە، لەهەمانکاتدا نەبوونی سەرچاوەی پێویست لەبەردەستدا بە زمانەکانی دیکە، بەتایبەت ئینگلیزی.

لەگەڵ ئەو کێشانەدا کارکردن لەم بوارەدا بە پێویستیەکی گەورە دادەنرێت بۆ خوێنەری کورد، هەم بۆ خویندکارانی بەشی مێژوو، کە دەکریت وەك ژێدەر (سەرچاوە - المصدر) سوودی لێببینرێت. بەوپێیەی یەکێك لە وانەکانی ئەو بەشە لە زانکۆکانی کوردستان لەسەر رۆژهەڵاتناسیە، لەهەمانکاتدا گرنگییەکی دیکەی لەوێدا دەبێت، کورتەیەك لەو کێشانەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا باس کراوە کە پێشینەیەکی باشە بۆ تیگەیشتن لە هەردوو بلۆکەکە.

لەکۆتایدا، سوپاس بۆ ئەو کەسانەی کە بۆ کێماسی و کەموکورتی و بۆشیەکانی ئەم پەرتووکە سەرنج و تێبینی دەدەن و وەك یەکەم بەرهەم بە سینگێکی فراوانەوە وەریدەگرن.

# سەرەتا

را و بۆچوونی جیاواز لەبارەی چەمك و زاراوە، مانا و پێناس، مێژوو و جیوگرافیای ڕۆژهەڵاتناسیەوە هەیە.

زۆرینـەی توێـژەر و نووسـەرانی ئـەم بـوارە، هـاوڕانین لەسـەر یـەك پێناسە و شێوەی تێڕوانین، بەڵام ئەوە ڕوونە، کـە ڕۆژهـەڵاتناس تـەنیا کەسـە ڕۆژئاوایـەکانن، کـە توێژینـەوە و بەدواداچـوون بـۆ لایەنـە جیاوازەکـانی ڕۆژهـەڵات دەکـەنو بـە کارەکـەیان دەوترێـت (ڕۆژهەڵاتناسی).

***ئەوەی گرنگە و پێویستە ئەوەیە، کە بۆچوونە جیاوازەکان لەم بارەوە بخرینەڕوو. تاکو بەرچاوڕوونی زیاتر لەو بارەوە هەبێت، هەروەها ئەو مێژووە قوڵەی بەریەککەوتنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا باس بکرێت، کە مێژووەکەی بۆ سەردەمی یۆنانەکان دەگەڕێتەوە، تاکو ئێستا کاری ڕۆژهەڵاتناسی و ئامانجەکانی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەو پێیەی سەرەتا بەشێوەی نارێك و بێ مەبەستی سیاسی کراوە، بەڵام لە سەدەکانی ناوەڕاست بە مەبەست و ئامانجی ئایینی، دواتر ئامانجی بازرگانی و لە سەدەکانی نۆزدەیەم و بیستەم، زیاتر ئامانجی داگیرکاری و کۆلۆنیالی لەپشتەوە بوو.***

## پیشینەی زاراوەی رۆژهەڵاتناسی

زاراوەی رۆژهـەڵات (شـرق)، یـاخود (خـاوەر شوناسـی) فارسـی، لـە زمـانی ئیگلیزیـدا بەرانبـەر بـە وشـەی ئۆرێنـت (Orient)، دادەنرێـت، مەبەست لێی ئەو بەشەی زەوییە، کـە لـەرووی جوگرافیـاوە دەکەوێتـە رۆژهەڵاتی ئەوروپا، کە بە وڵاتانی چین و یابان (ژاپۆن) دەستپێدەکات، لەوێشەوە بۆ هیندستان و پاکستان... و تا دەگاتە ئێران و چـەند وڵات و ناوچەیەکی دیکە دەگرێتەوە.

چـــەمکی ئۆرێنتـــال (Oriental) بـــۆ رۆژهـــەڵاتیو ئۆرێنتـــالیزم (Orientalism) بـۆ رۆژهەڵاتناسـی (ألإستـشراق)، بـەکاردەهێنرێتو ئـەو کەســەی ئــەم کــارە دەکــات و شــارەزایە لــە بــواری رۆژهەڵاتــدا بــە ئۆرێنتالیست (Orientalist) رۆژهەڵاتناس، ناودەبرێـت. لەبەرانبـەردا بـۆ پێناسە و خستنەرووی رۆژئاواناسـی، چـەمکی ئۆکسیدێنت (Occident) بو رۆژئاوا (الغرب)، هەروەها ئۆکسدێنتال (Occidental) بـۆ رۆژئـاواییو ئۆکـــسیدێنتیزم (Occidentism) بـــۆ رۆژئاواناســـی (ألإســـتغراب)، بەکاردەهێنرێت.[1] بنچینەی وشەی رۆژهەڵات، یان ئۆرێنت (Orient) لە ئۆرێنز (oriens)ی لاتینییەوە وەرگیراوە، بە مانای رۆژهەڵاتن و ناوچەی بەرزبوونــەوەی رۆژ دێـت، واتــە ئـەو شـوێنەی لـە رووی جیوگرافیـاوە رۆژهەڵاتی ناوچەی رۆژئاوایە، یاخود ناوچەی رۆژهەڵهاتنی جیهانە.[2]

هەروەها لە بەرانبەر زاراوەی رۆژهەڵاتدا، ئێمە زاراوەی رۆژئاوا، یان ئۆکسیدێنتمان هەیە کـە لـە وشـەی ئۆکسیدنت (occident)ی ئینگلیـزی وەرگیراوە. بەمەش ئۆکسیدنت (Occident)، ئەو ناوچەیەی گۆی زەوییە

کە ڕۆژ (خۆر)ی لێوە ئاوا دەبێت، هەروەها لە سەدەکانی کۆندا خەڵکی کیشوەری ئاسیا، زاراوەی رۆژئاوایان بە مانای ئاوابوونی خۆری ژیان و مردن بەکارهێناوە.(٣)

بەمەش رۆژهەڵاتیەکان، مانایەکی تاریك و رەشبینییان دابووە پاڵ هەموو کیشوەری رۆژئاوا، بەڵام ئەم جۆرە بەکارهێنانە، رەنگە بۆ مەبەستی بەکەم تەماشاکردن‌و کەمکردنەوەی بایەخی رۆژئاواییەکان بووبێت، گوایە رۆژهەڵات خۆری لێوە هەڵدێت، سەرەتای دەستپێکردنی ژیانە و بەشی ڕۆشنکەرەوەی جیهانە، رۆژئاوایش خۆری لێوە ئاوا دەبێت، کەواتە ژیان لەوێ کۆتایی دێت و پڕ دەبێت لە تاریکی، لە بەرانبەر ئەمەدا لەسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاست، مەسیحییەکان کاردانەوەیان هەبوو.

بە کورتییەکەی ئەوەی لە کۆندا بەکاردەهێنرا، ناوچەکانی جیهانی پێوە دەناسرا و دیارییدەکرا، کە زیاتر مەبەستێکی جیوگرافی بووە و وەك جیاکردنەوەی بەشەکانی جیهان لە یەکتر، هەروەك رۆژهەڵات ( orient) ناوچەی خۆر دەرکەوتن، بەرزبوونەوەو تیشکدانەوەیەتی‌و رۆژئاوا (occident)یش، ناوچەی دابەزینی خۆر، ئاوابوون و دیارنەمانیەتی. دواتر ئەم چەمکە لە لایەن ئەوروپیەکانەوە وەك چەمکێکی سیاسی و سەربازیی و رەگەزیی بەکارهێنراوە، مەبەست لێی ئاماژەدان بووە بە زەوی و ناوچەی ئاسیا بۆ باشووری ئەوروپا، درێژ دەبێتەوە بەرەو رێگای وڵاتی چین، دواتر وڵاتانی دیکەیش، بۆ ئەوەی ئەو جۆرە خەڵکە، لە خۆیان جیا بکەنەوە.(٤) لە نێو ئەم جۆرە

بەکارهێنانـەدا، هــەوڵ دراوە  وێنایــەکی جـوان و خــەیاڵی بـۆ ڕۆژئــاوا دروستبکرێت، ڕۆژهەڵاتیش وێنایەکی مەترسیدار و بەربەریەتی لەبارەوە خەیاڵکراوە، ئەمـە بـە درێـژایی مێـژووی ئـەو دوو کیـشوەرەی جیهـان، کاری لەسەر کراوەو تا ئێستاش بەردەوامە.

## پێناسە و تێگەیشتنی ڕۆژهەڵاتناسی

لـــە بـــارەی پێناســـە و ناســـینەوە و بۆچـــوونەکانی تایبـــەت بـــە ڕۆژهەڵاتناسی، قسەگەلێکی زۆر کراون و بۆچوونی جیـاواز هـەن، چ لـە لایەن ئەوروپی و ڕۆژئاواییەکانەوە بێت، یاخود لە لایەن ڕۆژهەڵاتییەکان خۆیانەوە، هەروەها لە نێو ڕۆژهەڵاتییەکاندا بۆچوونی جیاواز بـۆ زاراوە و تێگەیشتن لە ڕۆژهەڵاتناسی هەیە.

بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە پێناسی ڕۆژهەڵاتناسی، لێرەدا چەند پێناسە و بۆچـوونێکی جیـاواز دەخەینــەڕوو، ناکرێـت هــەموو بۆچـوون، یـاخود پێناســەکانی ڕۆژهەڵاتناســی بـاس بکـرێن، بـەو پێیــەی پێناســەگەلێکی زۆری بۆ کراوەو ناتوانرێت درێژەی پێبدرێت.

(مەکـــسیم ڕۆدنـــسۆن)، ڕۆژهەڵاتناســـی فەرەنـــسی، لـــە بـــارەی ڕۆژهەڵاتناسـییەوە دەڵێـت: "ڕۆژهەڵاتناسـی میتـۆدێکی زانـستییە، بـۆ خوێندنـــەوە و لێکۆڵینـــەوەی مێـــژووی شارســـتانیەتی ڕۆژهـــەڵاتی ئیسلامی".(٥)

بۆچوونێکی دیکە تاڕادەیـەك نزیکـە لـە پێناسـەکەی ڕۆدنـسۆنەوە، پێیوایە: "ڕۆژهەڵاتناسی لە تێگەیشتنێکی گشتییدا ئەوەیـە، کەسێکی

ئەکادیمی (ئەوروپی)، زیاتر لە ولآتانی ئیسلامی و رۆژهەلآتی ناوەڕاست و رۆژهەلآتی نزیك، لێکۆلینەوە و خوێندنەوەی زمان و فەرهەنگی رۆژهەلآت دەکات". [٦]

لەگەلّ ئەوەی زۆرێك لە توێژەر و نووسەرانی عەرەب و رۆژهەلآتی، رۆژهەلآتناسی بە زانست ناونابەن، کەچی نووسەری عەرەب د. مەحمود زەقزوق، رۆژهەلآتناسی وەك زانست دەناسێنێت و دەلێت: "رۆژهەلآتناسی بریتییە لەو زانستەی لێکۆلینەوە لە رۆژهەلآت دەکات، رۆژهەلآتناس بە مانا گشتییەکەی، بەسەر هەموو زانایەکی خۆرئاواییدا دەچەسپێت، کە لە رووی زمان و شارستانیەت و ئاداب و ئایینەکانەوە، سەرقالی شیکردنەوەی رۆژهەلآت بێت". [٧]

هەرچی دکتۆر محەممەد دسوقی ـ یە نووسیویەتی: "ئەم زاراوە، لە هەموو لقەکانی زانست دەکۆلێتەوە لە نێو میللەتانی رۆژهەلآتدا وەك: زمان، ئایین، زانست، ئەدەب، نەریت و هونەر، فکر و ئەندێشەی رۆژهەلآتیەکان"[٨]. سەرەڕای ئەوەی دسوقی، پێیوایە رۆژهەلآتناسی لە هەموو لقەکانی زانست دەکۆلێتەوە، بەلآم بە هەلّەیەکی زانستی دەزانێت، زاراوەکە وەك زانست و لە هەموو شتێك وەك زانست بکۆلێتەوە. [٩] واتە جیاوازی دەکات لە کاری رۆژهەلآتناسان ئەوانەی بەشێوەی بێ لایەنانە کار دەکەن، کارەکەیان بە زانست ناو دەبات، بە پێچەوانەشەوە راستە.

لە بەرانبەر ئەو بۆچوونانەی سەرەوە کە رۆژهەلآتناسی وەك زانست دەناسێنن و دیاری دەکەن، چەند ئاڕاستەیەکی پێچەوانەی ئەمانە هەن،

لەگەڵ ئەوەی هەندێك جار ڕۆژهەڵاتناسی بە زانست ناودەبەن، وەك ڕێگەخۆشکەر، بەشێك لە پەیامی داگیرکاری و شەرعیەتدان بە ئەوروپییەکان بۆ داگیرکردنی ڕۆژهەڵات دادەنێن. یەکێك لەو کەسانەی کاردانەوەی بەرانبەر ڕۆژهەڵاتناسان و ڕۆژهەڵاتناسی هەیە، بیرمەندی فەلەستینی (ئیدوارد سەعید)ە، کە بە سەرمەشقی ئەو بۆچوونە دادەنرێت و بە توندی ڕەخنەی لە کاری ڕۆژهەڵاتناسی گرتووەو پێیوایە ڕۆژهەڵاتناسی ڕێگاو میتۆدێکی زانستییە، لە لایەن ڕۆژئاوایی و ئەوروپییەکانەوە، بۆ دەستگرتن بەسەر ڕۆژهەڵاتدا. سەعید دەڵێت: "بە کورتی، ڕۆژهەڵاتناسی، ستایل و شێوازێکی ڕۆژئاواییەکانە بۆ دەستبەسەرداگرتن، بنیاتنانەوە و دەسەڵاتدارێتییە بەسەر ڕۆژهەڵاتدا.[(١٠)]

هەروەها سەعید، ڕۆژهەڵاتناسی، وەك ستایلو شێوازێکی دیکەی بیرکردنەوەی خۆرئاواییەکان کە لەسەر بنەڕەتێکی زانستی و ئەکادیمی بۆ جیاوازی دروستکردن لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هاتووەتە کایەوە، پێناسە دەکات، هەروەك بەشێکی زۆر لە نووسەر و شاعیرەکان، ڕۆماننووس، فەیلەسووف، تیۆریزانی سیاسی، ئابووریناس.... هتد، ڕازین لەسەر بنەمای جیاوازی دروستکردن لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بیرکردنەوەو لە نووسینەکانیاندا کاری لەسەر دەکەن.[(١١)]. بەڵام ئەوەی ئەو بیرمەندە فەلەستینیە باسی دەکات، لە بۆچوونەکانیدا توندە بەرانبەر بە ڕۆژهەڵاتناسان، ئەگەر بەشێکی ڕاستییەکی ئاشکرابێت، ئەوا بەشێکی دیکەی پەیوەندی بە کاردانەوەی

ژیانی سەعیدەوە هەیە، بەوپێیەی لە تەمەنی خوێندنی سەرەتاییەوە لەبەر دەستی مامۆستایانی رۆژئاواییدا خوێندوویەتیو تاکو مردنی لە ئەمریکا ژیاوە، لەو گۆشەیەوە بینیەتیەوە کە شێوەیەك بە کەم سەیرییان کردووە، یان هاورێ رۆژهەڵاتیەکانی بەشێوەیەکی کەم سەیرکراون. بۆیە نووسینەکانی بەدەرنین لەو جۆرە رەخنانە، جگە لەوەی ئەم بۆچوونانەی سەعید، لەلایەن عەرەبەکانەوە دەکرێتە چەکێکی باش بۆ رووبەڕووبوونەوەی رۆژئاوا، بەشێوەیەك هەموو شتێکیان رەتدەکاتەوە و بەپاڵپشتی داگیرکاری دادەنێت.

هەروەها هەندێکی دیکە لەوانەی نزیکن لە بۆچوونەکەی سەعیدەوە، دەڵێن: "رۆژهەڵاتناسی هێزی گفتوگۆ و سیستمێکە رێگە بە رۆژئاوا دەدات تا رۆژهەڵات داگیر بکات".[١٢]

هەرچی لە رووە فەلسەفییەکەیەوە، چەند کەسێك بەبۆچوونی جیاواز دەربارەی رۆژهەڵاتناسی نووسینیان هەیە، لەوانە: فاروق رەفیق، توێژەری کورد لە بواری فەلسەفە، دەڵێت:" ئۆرێنتالیزم هیچ نییە جگە لە گوتارێك، ئایدیۆلۆژیایەك، هیچ نییە جگە لە سادەترین و سەرەتایترین قۆناغی هۆشیاری، کە دەشێت ناوی بنێین بە هەڵوێست، یا قۆناغی هەستگەرایی لە رەوتی مەعریفەدا، کەواتە ئۆرێنتالیزم مۆدێکە، میزاجێکە، میزاجێکی تێڕوانینە، نەك مەعریفە، تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ درێژە بە ژیانی خۆی بدا، کە بتوانێ بەردەوام لە رووی چەندێتییەوە خۆی بەرهەم بهێنێتەوە"[١٣]

هەروەها بەشێك لە بیرمەندان و رۆشنبیرانی ئیسلامی، رۆژهەڵاتناسی وەك جێبەجێكاری پەیامی ئایینی مەسیحی (كریستیان) دادەنێن، بە هیچ جۆرێك بە زانستی نازانن، تەنیا بە تێكدەر و شێوێنەری راستییەكانی ئیسلام ناویان دەبەن، بەڵام ئەمەیش وەك پێشتر ئاماژەی بۆ كرا بۆچوونی هەموو بیرمەند و نووسەرانی ئیسلامی نییە.

پێویستە رۆژهەڵاتناسی، بە زانستی كۆكردنەوە، لێكۆڵینەوە و بە دواداگەڕانی كەسانی ئەكادیمیی رۆژئاوا دابنرێت، كە مەبەستیەتی لێكۆڵینەوەكە لەسەر هەموو لایەنەكانی ژیانی رۆژهەڵاتییەكان بكات، وەك زمان، ئەدەب، ئایین، زانستە جەبریەكان، مێژوو، جیوگرافیا، هونەر و داب و نەریت... هتد.

دەبێت ئاماژە بەوەیش بكرێت، ئەگەر رازی نەبووین بەوەی رۆژهەڵاتناسی وەك زانست ناوبهێنرێت، ئەوا پێویستە پاشگری (ناس) بەكارنەهێنرێت، بەڵام ئەگەر پاشگری (ناس) بۆ رۆژهەڵات، دابنرێت، ئەوا مانای زانست دەگەیەنێت، وەك زۆرێك لە زانستەكانی دیكە كە ئەو پاشگرەیان هەیە و وەك زانست ناسێنراون، ئەمەیش زانستبوونی رۆژهەڵاتناسی دەردەخات، بەڵام ناوهێنانی بە زانست، ناونانێكی رۆژئاواییەكانە و رۆژهەڵاتییەكانیش وەریانگرتووە.

دیارە ئەم پێناسە و ناساندنانەی رۆژهەڵاتناسی وەك زانست، كاری هەموو رۆژئاواییەك ناگرێتەوە، لەهەمانكاتدا ناكرێت بە یەك شێوە مامەڵە لەگەڵ كارەكانیان بكرێت، بەو پێیەی هەندێكیان مەبەستیان لێكۆڵینەوەی زانستی نەبووە، بەڵكو بۆ ئامانجی دیكە كاریانكردووە،

جا ئامانجی ئایینی، یاخود سیاسی و بازرگانی بێت، هەندێکی دیکە کاری زانستی و ئەکادیمیان کردووە و کارەکەیان چووەتە خزمەتی گەلانی رۆژهەلات، زۆرترین دۆکیۆمێنت، دەستنووس و بەلگەنامە کۆنەکانیان لە فەوتان ڕزگار کردووە.

بۆیە بێویژدانییە جیاوازی نەکرێت لە نێوان رۆژهەلاتناساندا، دەکرێت لێرەدا نموونەی دوو رۆژهەلاتناس بهێنرێتەوە، ئەوانیش (هادریان ڕیلاند) [(١٤)] رۆژهەلاتناسی هۆلەندیو (هنری لامنس) [(١٥)] رۆژهەلاتناسی بەلژیکی، هەردوو رۆژهەلاتناسەکە توێژینەوەیان لەبارەی ئیسلامەوە ئەنجامداوە، بە جۆرێك (هادریان)، نموونەی رۆژهەلاتناسێکە، کاری زانستی کردووە، بەبێئەوەی چاوپۆشی لە ڕاستییەکان بکات و بیانشارێتەوە، لەهەمانکاتدا (لامنس)یش، کاری نازانستی و شێواندنی کردووە و کارەکانی جگە لە سوکایەتیکردن بە ئاییینی ئیسلام، هیچی دیکەی لێ ناخوێنرێتەوە. بۆ ئەمە بڕوانە بەشی سێیەم کە بەشێك لەتێڕوانینی لامنس، بەرانبەر ئیسلام و پەیامبەرەکەی دەخەینەڕوو.

## پێشینەی بەکارهێنانی زاراوەی رۆژهەلاتناسی

سەبارەت بە بەکارهێنانی وشەی رۆژهەلات و رۆژئاوا، مێژوویەکی دوور و درێژ و کۆنی هەیە، ئەوەی ڕوونە و دەزانرێت لەسەردەمی یۆنانی کۆنەوە ئەم زاراوانە بەکارهێنراون.

سەرەتا هەردوو زاراوەی رۆژهەلات و رۆژئاوا، لە لایەن رۆژئاوای و ئەورووپاییەکانەوە بەکارهێنراوە، هەروەها مەبەست و ئامانج لە

بـەکارهێنانی وشـەکە جیـاواز بـووە و لەسـەردەمی جیـاوازدا، زاراوەی جیاواز بەکارهێنراوە، واتە هەمان مەبەست و هەمان تێگەیشتن نـەبووە کـە ئێـستا بـۆ رۆژهەڵاتناسـی بـەکاردەهێنرێت. لـە سـەردەمی یۆنانییەکانـدا، زاراوەی رۆژهـەڵاتی بـۆ جیاکردنـەوەی خـەڵکی ئاسـیا لـەخۆیان، کـە بـە چـاوێکی کـەمتر تەماشـای ئاسـیاییەکانیان دەکـرد، بەکاردەهێنرا، لەهەمانکاتدا زاراوەی رۆژئاوایی بۆ خەڵکانێکی هۆشیار و بلیمەت بەکارهێنراوە.

هەرچی لەسـەردەمی رۆمانەکانـدا، ناسـاندن و پێناسـەی رۆژهـەڵاتی هەنـدێك گـۆڕانی تێـدا کـراوە، مەبەسـت لـە بـەکارهێنانی رۆژهـەڵات لـە پێناسەی یۆنانییـەکان جیـاوازتر بـوو، هـەروەك هەنـدێك لـە ناوهێنـانی وشەی ئاسیا، حەزیان لە وشـەی رۆژهـەڵات نـەبووە، بۆیـە زۆر جـار لـە ئەدەبی رۆمانیدا، چەمکی ئەوروپا و ئاسیا، بۆ ئاماژەدان بە رۆژهەڵات و رۆژئـاوا بـەکارهێنراوە، ئەمـەیش بـە پێـی بەشـەکانی ئیمپراتۆرەکـەوە دابەشبوونی بووە.[١٦]

هەرچەندە بە هـۆی سـوود وەرگـرتنی شارسـتانیەتی رۆژهـەڵات، بـە تایبەت لە کەناراوەکانی دەریای ناوەڕاست، لە لایەن نووسەر و ئەدیب و هەنـدێك لـە پیـاوە سیاسـییەکانەوە، بـە تونـدی رەخنـە گـیراوە لـەو هەڵوێستەی بەرانبەر بە رۆژهەڵات هەیبووە.[١٧]

هەروەها زاراوەی رۆژئاوا و لایەنـەکانی وەك شارسـتانیەتی رۆژئـاوا، کـەلتووری رۆژئـاوا و لایەنـەکانی دیکـە لـە سـەدەی نۆزدەیەمـدا، لـە نووسـینەکانیاندا سـەریهەڵدا، وەك مانابەخـشین بـە ڕووداوەکـانی ئـەو

کیشوەرە، هەروەها بۆ لێکجیاکردنەوەو دروستکردنی درزێك لەگەڵ رۆژهەڵات.[18] ئەمەیش بە مانای بەردەوامییدانە بەو پرۆسەیەی کە لە مێژوویاندا دروستیانکردووە، وەك ئاشکرایە پێشتر زاراوەی ئەوروپایان بەکاردەهێنا، بەڵام لە پاڵ گەشەکردنی ئەمریکا و شارستانیەتەکەی و دابڕانی وڵاتانێکی وەك ڕوسیا و ئۆراسیا، دواتر زاراوەی رۆژئاوا هاتە کایەوە.

هەرچی لای موسوڵمانانە، زاراوەی رۆژهەڵاتناسی نەبوو، ئەو کارانەی لەسەر رۆژهەڵات دەکرا پێیان دەوترا (دیراسات) واتە دیراساتی ئایین، ئابووری، زمان و لایەنەکانی دیکەیان دەکرد، لە وڵاتی چین و یابانەوە تاکو ناوەڕاستی ئاسیا، ئێران، تورکیا، کوردستان و شوێنەکانی دیکەی نیشتیمانی عەرەب.[19]

بەڵام زاراوەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، لەسەردەمانێکی دواتر لە نووسیندا رۆئاواییەکان بەکاریانهێناوە، بە جۆرێك بۆ یەکەم جار زاراوەی رۆژئاوا، لە نێو نووسین و فەرهەنگەکاندا، بۆ سەدەی نۆیەم و دەیەمی زایینی دەگەڕێتەوە، کە ئەوکات لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردا بەکارهێنراوە.[20]

زاراوەی رۆژهەڵاتناسیش بە هەمان شێوە چەند سەدەیەکی دواتر لە فەرهەنگ و نووسیندا بەکارهێنراوە، ئەویش یەکەم جار لە لایەن "لۆرد بیرۆن" لە ساڵی (١٧٦٩) لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد بەکارهێنراوە، ساڵی (١٨٣٩) لە فەرهەنگی زانستی فەڕەنسی بڵاوکراوەتەوە. ئەم زاراوە، بۆ هەموو لقەکانی زانست بەکاردێت، کە تیایدا لێکۆڵینەوەی لەسەر ئاسیا

کراوە، وەکو هونەر، ئەدەب، مێـژوو، ئـابووری و لایەنـەکانی دیکـە.[٢١]
بەمەیش دواتر گەشـە بـە زاراوەکـە دراوەو چـەندین پـەیمانگا و لـق لـە زانکۆکان بە ناوی ڕۆژهەڵاتناسییەوە دامەزراوە.

## جیوگرافیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوا
## لە دروستبوونی تێگەیشتنی ڕۆژهەڵاتنـاسی

جیوگرافیـا، لایـەنێکی سـەرەکییە لـەو جیـاوازی و پانتاییـەی کەوتووەتە نێـوان ڕۆژهـەڵات (ئاسـیا) و ڕۆژئـاوا (ئـەوروپا و ئـەمریکا)، چـونکە ڕۆڵـی جیـوگرافی کـەم نییـە لـەم نێوەنـدەدا، بگـرە هۆکـاری سەرەکی بووە لەسەرەتاوە بۆ بۆچـوونی جیـاواز لـەبارەی یـەکترو خـۆ لەیەکتر جیاکردنەوە، هەرچەندە لە ئێستادا لێـرە و لـەوێ، بـاس لـەوە دەکرێت کە پێویستە، ئەو دوولەتکردنەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بسڕێتەوە و چیتر بەکارنەهێنرێن، بەڵام ئەمە دەگمەنە تا ئاستی مـەحاڵ، هـەرگیز ڕوونادات، بەو پێیەی بە درێژایی مێـژوو زاراوەی هـەردوو کیـشوەرەکە بـەکارهێنراوە، بـەردەوام دووپـەرتبوون و جیـاوازی لـە نێـوان هـەردوو پارچەکەدا دروست کراوەو کار بۆ ئەو مەبەستە کـراوە، بـە تایبـەت لـە لایەن ئەوروپیو ڕۆژئاواییەکانەوە.

مێــژووی دابەشــبوونی جیوگرافیــای نێــوان کیــشوەرەکان، بــۆ سەردەمی یۆنانییەکان دەگەڕێتەوە، کە لەو سەردەمەوە جیهانیـان بـۆ سێ کیشوەری ئاسیا، ئەوروپا و لیبیا (ئەفریقا)، دابەشکردووە و دواتـر بەو شێوە ناویان دەبرد، بەڵام پـێش باسـکردنی بۆچـوونەکان لـەبارەی

جیۆگرافیـــای کیـــشوەرەکان، پێویـــستە ئامـــاژە بـــەوە بـــدرێت، ئـــەو دابەشبوونە جیوگرافیایەی لە کۆندا تاکو ئێستا دیارییکراوە، وەك خۆی نەماوەتەوە، واتا شتێکی نـەگۆڕ و جـێگیر نـەبووە، چـونکە لـە یۆنـانی کۆندا رۆژهەڵاتیان گرێداوە بـە دەسـەڵاتی ئێرانییەکانـەوە، لـە کاتێکدا ئێران هەموو ناوچەکانی رۆژهەڵاتی لەژێر دەستدا نەبووە، بـەڵام کاتێـك ئەسکەندەری مەقدۆنی (٣٥٦ــ٣٢٣ پ. ز) دەڕواتە ئاسـیا و رۆژهـەڵات، ئەمە گۆڕانی بەسەردا دێـت، بـە تایبـەت ئـەو کاتـەی کـە ئەسـکەندەر، خاکی ئێرانییەکانی داگیر کرد.[٢٢] ئەو دابەشبوونەی کیشوەرەکان بـەم شێوەیە بۆ سەدەی نۆیـەم تـا پێنجـەمی پـێش زایـین دەگەڕێتـەوە.[٢٣] بەڵام ئەوەی یۆنانییەکان وێنای کیشوەرەکانیان لای خۆیـان کێشابوو، وەك ئـەو دابەشـبوونەی ئێـستا نییـە، کـە ئـەوروپا بەشـی سـەرەکیی کیشوەر بێت، چونکە ئەوان (یۆنانییەکان)، خۆیان بە بەشـێکی جیـاواز لە ئەوروپا دادەنـا، لەبەرئـەوەی ئـەوروپا لای ئـەوان تـەنیا ناوچـەکانی رۆژهەڵات و باکووری یۆنان بوو، کە ئەمـە بـەردەوام دەبێـت بەدرێـژایی باکووری کەناری دەریای ناوەڕاست و دەریای رەش، هـەروەها زاراوەی ئاسیا، بەو ناوچـانە دەوتـرا، کـە لـە رۆژهـەڵاتی ڕووبـاری نیـل (یـاخود نۆکەندی سـوێز)ی میـسر و ڕووبـاری تانیـاز (دۆن)، تـاکو کۆتاییـەکانی رۆژهەڵاتی دەریای رەش، درێژدەبنەوە، دواتریش زاراوەی (لیبیا)ی ئەو کات کە ئێستا ئەفریقایە بۆ زەوییـەکانی باشـووری دەریـای ناوەڕاسـت بەکاردەهێنرا.

هــەروەك خرایــەڕوو ئــەم دابەشــبوونەی كیــشوەرەكان لــە لایــەن یۆنانییەكانــەوە جــێگیر و چەســپاو نــەبووە. ڕاســتە تائێــستا شــێوەی دابەشبوونە جیوگرافیەكـەی لەیەكـەوە نزیكـە، بـەڵام گـۆڕانی بەسـەردا هاتووە، بەو پێیـەی لـە سـەدەی چـوارەمی پـێش زایینـی، (ئەریستۆ) فەیلەسووفی یۆنانی لێكجیاكردنەوەی كیشوەرەكانی بەستووەتەوە بـە لایەنی رۆشنبیری، رۆحی و توانای جەستەیانەوە، هـەروەك پێیوابـووە، ئەوروپیەكان كەسانی رۆحـی و پڕاوپـڕن لـە جـوانی، خـەڵكانێكن زیـاتر هەستەوەرن و لایەنی رۆحییان بەهێزە، بەڵام لایەنی زرنگی و زیرەكی و دەسـتڕەنگینییان دەوێـت، هەرچـی مرۆڤـی ئاسـیایە، بـە پێـچەوانەی ئەوروپییەكانەوە، بە توانا و زیرەكن، كەچـی لایـەنی رۆحـی و گیانیـان لاوازە و پێویستیان بە پڕكردنەوەی ئەم لایەنەیە، بـەڵام لـە نێـوان ئـەم دوو كیشوەرەدا خەڵكانێك دەژین لە نەژادی هێلینیـەكانن، كـە هــەردوو لایەنەكەیان تێدا بەدیدەكرێت، بە جۆرێك ئاستێكی باشـی رۆشـنبیری و زیرەكییــان هەیــە، لەهەمانكاتــدا لایــەنی رۆحییــان بــەرز و لەئاســتی باڵادایە.[٢٤]

بۆ زیاتر پاڵپشتی و سەلماندن و خستنەرووی بۆچـوونی دیكـە نزیـك لەم بۆچوونەوە، پێویستە ئاماژە بە ئەفسانەكانی یۆنانی كـۆن بـدرێت، بەو پێیەی خاوەنی ئەفـسانەگەلێكی زۆرن، سەرچـاوە مێژووییـەكانیان بەستووەتەوە بە ئەفسانەوە، لەوێشەوە خۆیـان بەسـەر رۆژهەڵاتـدا بـە باڵا دەزانن، و هەژموونی خۆیان دەسەپێنن.

به گوێرەی بۆچوونەکانی هەندێك لە رۆشنبیر و توێژەرانی بواری ئەفسانەی رۆژئاوا، دانیشتووانی ئەوروپا، لە نەوەی کچی پاشای تایری (tyre) [٢٥] یە، کە خواوەندە (زیۆس) پەیوەندیی خۆشەویستی لەگەڵی بەستووە، بەپێی گێڕانەوەو گەشەسەندنی ئەفسانەکانی دیکە، چەند منداڵێکیان بووە، کە نیوەی خوشکەکانیان لە ئاسیا و لوبنان بوون، نیوەکەی دیکەی لە ئەوروپا، ئەمەیش بووە ناونانی ئەو کیشوەرانە، یۆنانیش بووەتە بەشی سەرەکیی کیشوەرەکە و دژایەتیی دوورگەکانی ئیجەی کردووە. [٢٦]

هەروەك لە ئەفسانەی یۆنانییەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە، لە چەندین شوێنی دیکەیش قسەی لە بارەوە دەکرێت، یۆنانییەکان خۆیان بە بەشێك لە دەرەوەی ئەوروپا داناوە، یۆنان کە ئاسیا و ئەوروپا جیا دەکاتەوە، خۆی بە جیوگرافیایەکی جیاواز دادەنێت. لەگەڵ ئەوەی یۆنانییەکان پێش رۆژژمێری زایینی، تیشکیان خستووەتە سەر هەر سێ کیشوەرەکە و رازی بوون بەوە، بەڵام لە نووسینەکانیاندا ئاماژەیان بە زاراوەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، فارس و یۆنان، ئاسیا و ئەوروپا، کردووە. [٢٧]

ئەو ناساندنەی یۆنانییەکان بە کیشوەرەکانیان دابوو، لەسەردەمی رۆمانەکان، تا ڕادەیەکی کەم گۆڕانی بەسەردا هات، چەند لایەنێکی دیکە درایە پاڵ ناسنامە و جیوگرافیای کیشوەرەکان، لەبەر ئەوەی رۆمانەکان زیاتر لەسەر ئاستی ئۆقیانووس، زەریا، دەریا و ڕووبارەکان بووە و چۆن دەورپشتی کیشوەرەکانیان داوە. [٢٨] رۆمانەکان فیکرەی

رۆژئـــاوایی و رۆژهـــەڵاتیان بـــۆ بەشـــەکانی ئیمپراتۆرەکـــەی خۆیـــان بـــەکاردەهێنا، هـــەروەها لەســـەردەمی رۆمانـــەکان ئـــەو ناســـاندن و پێناســـەیەی بـــۆ رۆژهـــەڵات هـــەبووە، تاڕادەیـــەك جیـــاواز بـــووە لەگـــەڵ بۆچوونی یۆنانییەکان و گۆڕا.[29] هـەروەك پێـشتریش ئەمـە بـاس کـرا، بۆیـە لێـرەدا دووبـارە نابێتـەوە، بـەڵام ئەوەنـدە هەیـە هەنـدێکیان بـە شێوەیەکی ناشیرین باسی رۆژهەڵاتیان کردووە، ئەمەش لە کاتی گەشت و هاتنیان بۆ وڵاتانی رۆژهەڵات، دەردەکەوێت.

هەرچـــەندە لـــە لایـــەن نووســـەر و ئـــەدیب و هەنـــدێك لـــە پیـــاوە سیاسییەکانەوە، بە توندی رەخنە گیراوە لەو هەڵوێستەی بەرانبـەر بـە رۆژهـــەڵات هـــەبووە، بـــەهۆی ســـوودبینین‌و وەرگرتنـــی شارســـتانیەتی رۆژهـــەڵات، بـــە تایبـــەت لـــە کـــەناراوەکانی دەریـــای ناوەڕاســـت.[30] لەسەردەمی رۆمای رۆژهەڵات، وەك بەڕێوەبەرایەتیی ئیمپراتۆری رۆمای گەورە، لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زایین کاریان کردووە کە وەك ئاماژەیان بـۆ دەکـرد، ئـەوروپا لـەم ناوچـانە پێکهـاتووە (یۆنـان، بەشـــەکانی بـــەلقان، ئیتالیـــا، باشـــووری ئیـــسپانیا، ئـــەنادۆڵ، ســـوریا، باکووری میزۆپۆتامیا، میـسر بەشـێکی زۆر لـە کـەناراوەکانی بـاکووری ئەفریقا)، ئەمـەیش نـەك تـەنیا بـە میراتـی قەیسەر و ئۆگستۆس ڕازی بـــوون، بـــەڵکو خۆیـــان وەك خـــاوەن دەســـەڵاتی ناوچـــەی (مەســـیحی) کریستیانی دادەنا.[31]

دوای لاوازبوونی ئیمپراتۆری رۆمای کۆن و رۆژئاوا، رۆمای رۆژهەڵات، یاخود بیزەنتینەکان، لە قوستەنتین (ئەسـتەنبوڵ) دامـەزرا، چـیتر ئـەم

بەشەی ئیمپراتۆرەکە وەك ئاسیا ناسێنرا، ناسنامەی رۆمای رۆژهـەڵاتی بەسەردا بڕا و جیاکرایـەوە لـە رۆمـای رۆژئـاوا، بۆیـە ئایـدیای رۆژئـاوا، جێگەی رۆژئاوای ئیمپراتۆری رۆمانی گرتەوە، ئەمە پەرەی سەند تـاکو سـەدەکانی ناوەڕاسـت و وەك بەرەنگارییـەکی ئیمپراتـۆری بیـزەنتین (رۆژهەڵات).[٣٢]

لەمەوە، لە سەدەی پێنج تا نۆیەمی زایینی و رووخانی ئیمپراتـۆری رۆما و دروست بوونی بێزەنتین، ئاسیا، میراتی رۆژهەڵاتی بەسەردا بڕا، ئەوروپایش میراتی کریستیانی (مەسیحی) و جولەکەی درایە پاڵ، لەگەڵ ئەوانـە و دواتـریش، لـە سـەدەکانی سـەرەتای زایینـی، کریـستیانێتی تێگەیشتنێکی (ئینجیل)یانەیان خستە پاڵ ئەو سێ کیشوەرە. هەروەك بەپێی تێگەیشتنەکانی (سانت ئۆگستین، ٣٥٤ــ٤٣٠ ز) باسـی دەکـات، پێیوایـە شووناسـی هەریـەك لـەو سـێ کیـشوەرە و نیـشتەجێبوونیان، دەگەڕێتەوە بۆ شەجەرەناسی ئایینی مەسیحی، وەك باسی کردووە، لە دوای (تۆفانەکـەی نـوح)، نـوح سـێ کـوڕی هـەبوو، هـەر کـوڕێکی لـە ناوچـەیەك نیـشتەجێ بـوون: جافەیـەت (یـافس) لـە ئـەوروپا، سـام لـە ئاسیا، و حـام لـە ئـەفریقا، بـەڵام ئـەم پێناسـەیە هـەروەك هەنـدێك لـە لێکۆڵـەران باسـی دەکـەن، تـەنیا بـۆ باڵادەسـتیی کریـستیانییەتیەکە ڕاگەیەنراوە[٣٣]

هەرچەندە نووسین و بۆچوونەکانی (ئیبن کەسیر) تـا ڕادەیـەك لـەم گێڕانەوە نزیکـە، بـەڵام ئـیبن کەسـیر، کـە بـاس لـە جافەیـەت (یـافس) دەکـات دەڵێـت: بـاپیرانی (تـورك، سـەقالیبە، یـەئجوج و مـەئجوج)ە،

هەرچی نەوەکانی سام، لە عەرەب و فارس و ڕۆمەکانە، حامیش، قیبتی سۆدانی و بەربەرەکانە.[٣٤] ئەوەی بۆچوونەکانی ئیبن کەسیر جیا دەکاتەوە، جیاوازیی نێوان کیشوەرەکان ناخاتە ڕوو، گوایە نەوەی هەر کوڕێکی نوح، میراتگری کیشوەرێك بێت، بەڵام لە سەدەی شازدەیەم بە دواوە بە تایبەت سەردەمی ڕێنیسانس، خەونی یەکێتی کۆمەڵگەی کریستیانی پەرەی سەند، ئەمە زیاتر جۆرێکە لە یەکگرتنەوەی ئایینی، کە ئایینی جولەکەیشی گرتەوە.[٣٥]

هەروەها لە پاڵ گەشەکردنی ئەمریکا و دەرکەوتنی وەك هێزێکی گەورەی جیهان، بەتایبەت لە سەدەی نۆزدەیەم، بەتایبەتتر لە سەدەی بیستەم و دابڕانی وڵاتانێکی وەك رووسیا و ئۆراسیا، زاراوەی رۆژئاوا هاتەکایەوە، بەو پێیەی زاراوەی ئەورووپا کۆنتر بوو، جۆرێك شانازییکردن بە ئەمریکا، لەهەمانکاتدا خۆیان بە خاوەنی شارستانیەتی ئەمریکا دەزانی، بەو پێیەی بەشێکی زۆر لە خەڵکی ئەمریکا، رەسەنیان لەچەند وڵاتێکی ئەورووپا پێکهاتبوون، لەهەمانکاتدا خۆیان لەبەرەیەك بەرانبەر رۆژهەڵات دەبینیەوە.

هاوڕێ، ئەورووپا، ڕێنسانس، چاکسازیی ئایینی و دۆزینەوەکانی لەخۆدەگرت، لەمەوە زیاتر گەشە بە چەمکی رۆژئاوا درا، هەڵبەت لە ژێر رەحمی گەشەکردنی ئایدیا جیاوازەکانی ئەورووپادا.

لە سەدەی (١٧و ١٨)دا گەڕیدە و دۆزەرەوانی جیوگرافی، زۆریان لە بارەی جیوگرافیای ئاسیاوە دۆزیەوە، چەمکی نوێیان بۆ بەکاردەهێنا و لە ئەورپایان جیادەکردەوە، نەك تەنیا لە رووی

جیوگرافیەوە، بەڵكو لە رووی كەلتووری، زانستی، رۆشنبیری و جۆری ژیانیشەوە.

دواتر فەیلەسووفی ئەڵمانی (هیگڵ) لە نووسینەكانی كیشوەری ئاسیایی بۆ دوو بەش دیارییكرد، ئاسیای سەروو (باڵا) و ئاسیای (دوور)، لە ئاسیایی سەروو رەگەزی (قەوقازی)ەكانو پاشماوەی ئەوروپییەكانی لێ نیشتەجێیە، لە ئاسیای دووریش رەگەزی (مەغۆلەكان)ی لێ نیشتەجێیە، لەبەرئەوە ئەم جیاكردنەوە لە نێوان ئاسیای نزیك كە بە شێوەی سەرەكیی ئیسلامی تێدا نیشتەجێیە، ئاسیای دووریش چین و یابان نیشتەجێن.[٣٦]

ئەوەی لە كۆنەوە هاتبوو و خەڵكی پێدەناسرایەوە تاكو سەدەكانی ئەم دواییە، بووە داڕێژراوێك و خەڵكی كیشوەرەكانی پێ دەناسرێتەوە، بەڵام لە پاڵ ئەم جیاكردنەوە و ناسینەوەدا، دەیان و بگرە سەدان بۆچوون هەبوو، كە رۆژئاوای بە سۆپەرمان و مرۆڤی باڵا ناودەبرد و ستایشی دەكردن، لەهەمانكاتدا زۆرێك لەو خاوەن بۆچوونانە، ئاسیاو ئەفریقا و كیشوەرەكانی دیكەی وەك ژێر دەست، كۆیلە، نەزان و نەخوێندەوار ناودەبرد .

لە سەدەی هەژدە و نۆزدەیەم و پشت بەستن بە بۆچوون و تیۆرەی فەیلەسووف و ڕووناكبیران، ڕوانگەی رۆژئاواییەكان سەبارەت بە جیاوازییە جیوگرافییەكان و دابەشكردنی زەویی نێوان كیشوەرەكان، كە تائێستاش بەردەوامە، بە تەواوەتی ئاشكرا بوو. ئەوەش دەركەوت كە تێگەیشتنێكی خراپ بەرانبەر مرۆڤەكانی دەرەوەی كیشوەری

ئەورووپا و رۆژئاوا هەیە، کە وێنەیەکی ناڕاستە و دروستکراوە، بۆیە زەحمەتە بتوانرێت ئەو وێنای رۆحبەرزی و جوامێرییەی ئەوان بسڕێتەوەو لەسەر ئاستی مرۆڤ مامەڵە بکرێت، نەك لەسەر ئاستی رەگەز و رەنگی پێست و نەژاد.

## سەرەتاکانی مێژووی رۆژهەڵاتناسی

هەروەك قسە و بۆچوونی جیاواز لە بارەی زاراوە، پێناسە و جیوگرافیای رۆژهەڵاتناسییەوە هەیە، ئاوهایش بۆچوونی جیاواز لە بارەی مێژووی رۆژهەڵاتناسییەوە هەیە، زۆرینەی شارەزایانی ئەم بوارە، بۆچوونیان جیاوازە بۆ دەستپێکردنی مێژووی رۆژهەڵاتناسی، یاخود ساڵ، کات و بەروارێکی دیاری کراو نییە، بۆ دەستپێکردنو دەستنیشانکردنی رۆژهەڵاتناسی. هەندێك بۆچوون لەسەر ئەوە کۆکن، ئەو مێژووە بۆ حکومڕانی موسوڵمانان لە ئەندەلوس (ئیسپانیا) دەگێڕنەوە.

بۆچوونێکی دیکە باس لە شەڕی بەناو (خاچدروشمان) (حرب الصليبيين) دەکات، لەگەڵ ئاماژەدان بە کۆنگرەی (ڤیەننا) لەساڵی (١٣١٢ ز)، هەروەها بۆچوونێکی تریش کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، بە سەرەتای کاری رۆژهەڵاتناسی دادەنێن.[٣٧]، ئەمانە هەموویان راستن، قۆناغی دیار و روونی بەرەوپێشچوونی رۆژهەڵاتناسیین، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت، مێژووی ململانێکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، هەروەها لێکۆڵینەوەو

قسەکردن لەسەر ڕۆژهەڵات، بۆ سەدەکانی پێش زایین و سەردەمی یۆنانییەکان دەگەڕێتەوە، نەك بۆ سەدەکانی ناوەڕاستو ململانێو کارەکانیان لەگەڵ ئیسلام بە تەنیا، بەڵکو مێژووی گەڕان، توێژینەوە و قسەکردن لەبارەی کیشوەری یەکترەوە، زۆر لەوە کۆنترە، جگە لەوەی ڕۆژئاواییەکان، تەنیا لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئیسلام نەکردووە و بەس، بەڵکو قسە و باسیان لەسەر هەموو گەلان و لایەنە جیاوازەکانی ڕۆژهەڵات، بەدرێژایی مێژوو کردووە.

دەبێت ئەوەیش بخرێتە ڕوو، لە سەدەکانی (١١ و ١٢ زایینی) بەدواوە لقی زانکۆیی لە ڕۆژئاوا، بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆژهەڵات، تەرخانکراوە. ئەمەش بە سەرەتایەکی کاری ئەکادیمی و زانستی دادەنرێت، بەڵام پێش ئەوە کاری ڕۆژهەڵاتناسی بە شێوەی نارێك و پێك و نارێکخراو هەبووە، (واتا زۆرێك لەو کەسانەی توێژینەوەیان لەبارەی ڕۆژهەڵاتەوە کردووە، بەویستی خۆیان بووە، کەمتر بە مەبەستی سیاسی و ئابووری لەپشتەوە بووە)، قسەیان لەسەر ڕۆژهەڵات کردووە و بۆچوونی خۆیان دەربڕیوە، بەو پێیەی بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی و لەگەڵ زانیاریی کۆکردنەوە لەسەر مرۆڤەکان و ژیار و ژیانیان، ئەوە ئاشکرا بووە کە مرۆڤ بەردەوام لە جوڵە و بزاوتن و ئاڵوگۆڕی ناوچەکاندا بوون. تێکەڵبوونی ئەم هۆز لەگەڵ ئەوی دی، کۆچکردن لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی و کەلتووری لە نێوان گەل و کۆمەڵە جیاوازەکان سەریهەڵداوە، و کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەبووە. ئەم لێکنزیکبوونەوە

بە تێپەڕبوونی کات فراوانتر بووە، سەرەتا ناوچە و هەرێمە نزیکەکان لەگەڵ یەکتر پەیوەندییان هەبووە، دواتر دەگاتە تێکەڵی نێوان وڵاتان و کیشوەرەکان.

بۆیە لێرەوە تێکەڵاوبوون و سوودوەرگرتن لە شارستانیەتی نێوان هەردوو بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە چوارچێوەی ئەو گۆڕانە مێژووییانەی شارستانییەتەکاندایە، بۆیە ئەوە دروست نییە بوترێت، لێکۆڵینەوەی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژهەڵاتناسی بەرهەمی سەدەی بیست و مێژووی هاوچەرخە، چونکە تێکەڵبوون، ئاڵوگۆڕی شارستانیەتەکانو کەلتوورەکان لە پێش زایینەوە دەستپێدەکاتو لە سەدەی بیست دەگاتە لوتکە، واتە ڕۆژهەڵاتناسی لە نێو ئەو کاروانە درێژەی نزیك بوونەوە، زانیاری کۆکردنەوە لەبارەی یەکترەوەیە، نەك بەتەنیا بەرهەمی سەردەمی هاوچەرخ بێت.

دەکرێت لەو سەردەمە، لە چاخەکانی ناوەندی یۆنانەوە، ئەو کاتەی کە یۆنانییەکان کەسانی بێگانەیان بە (بەربەری) ناوبردووە، دواتر وەك کۆیلە تەماشایان کردوون، هەنگاوێك بوو بۆ هەژموونی ڕۆژئاوا و دەرکەوتنی ڕۆژهەڵاتناسی، وەك ئەوەی ڕێگەخۆشکەرێکە بۆ تەماشاکردنی خود بە سۆپەرمان لە لایەن ڕۆژئاواییەکانەوە، هەم وەك ئەوەی زانیارییان لە بارەی گەلانی ڕۆژهەڵاتەوە هەبوو، ئەمە دواتر گەڕیدە و مێژوونووسانی یۆنانی و ڕۆژئاوایی هەوڵیان بۆ داوە، تا زانیاری لە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە کۆبکەنەوە و گەشتی ئەو کیشوەرە بکەن.

هـەروەك چـەندین گەڕیـدە و فەیلەسـووفی یۆنـانی بـۆ ناوچـەكانی ڕۆژهەڵاتی كۆن ڕۆیشتوون، وەك (سۆلۆن، فیساگۆرس و تلیس) چەندین ساڵ لەسەردەمی بابلییەكان و شـاری بابـل (عێراقـی ئێـستا) گـەڕاون و بۆچوونی فەلسەفی خۆیان گەڵاڵە كردووە.(٣٨)

هەرچی لەسـەردەمی هـاتنی ئەسـكەندەری مەقـدۆنی و پـەلاماردانی ڕۆژهەڵاتە، وەك ڕووداوێكی گرنگ و بەرچاو لە مێژوودا تەماشا دەكرێت، دەتوانرێـت وەك خـاڵی دیـار لـە بـیری ڕۆژهەڵاتناسـی لـە لایـەن ڕۆژئاواییەكانەوە تەماشا بكرێت، كە دواتر ژمارەیـەك گەڕیـدەی یۆنـانی هاتنـە ڕۆژهـەڵات، لـە شـارەكانی ڕۆژهـەڵات نیـشتەجێ بـوون و دوای ئەمـەیش شـەپۆلێكی بازرگـانی لـە نێـوان هـەر دوو ئاسـیاو ئـەوروپا دەستیپێكرد.(٣٩)

یەكێك لە سەرباز و گەڕیدە ناسـراوەكانی یۆنـان (زەینـەفۆن)، یـان (گەزنەفۆن)ە، كە هاتووەتـە ئاسـیا و لـەبارەی ڕۆژهەڵاتـەوە نووسـینی هەبووە، لە نووسینەكانیدا بۆچوونی لە بـارەی ئـەو شـوێنانەی گـەڕاوە دەربڕیـوە و تیـشكی خـستووەتە سـەر زۆر لایـەنی ژیـان، دەكرێـت كارەكانی بخرێتە چوارچێوەی كاری ڕۆژهەڵاتناسییەوە، بەو پێیەی كـە زانیـاری، بۆچـوونی خـۆی لـەبارەی ڕۆژهەڵاتـەوە نووسـیوەتەوە و بـە یۆنانییەكانی گەیاندووە. بۆ زانیاری زیاتر لەسـەر ئـەو بابەتـە دەتـوانن سەیری (یاداشـتەكانی گەزنـەفۆن) لـە وەرگێڕانـی: محەممـەد مەسـعود محەممەد، بكەن.

لەسەردەمی ئیمپراتۆری رۆمای (رۆژئاوا) و رۆمای رۆژهەڵات (بیزەنتین)، بە شێوەیەکی گشتی قسەیان لەسەر دەسەڵاتە جیاوازەکانی حوکمڕانی، شارستانیەتە کۆنەکانی عێراق، میسر، چین، هیندستان، ئێران و ئەنادۆڵ کردووە، بۆیە جیاوازی بیروڕا نەکراوە لەسەر هەریەك لەو شارستانییەتانەدا و بە یەك چاو تەماشاکراون، لە رووی بەراوردکردنیان بە شارستانیەتی رۆما و یۆنان، ئەویش وەك نەزان و بەربەری و کۆیلە تەماشاکراون، ئەوروپاییەکانیش وەك بلیمەت و عاقڵ تەماشا کراون.

بە بۆچوونی ئیدوارد سەعید[٤٠] سەردەمی خۆپەسەندی (نێرگسیەت)، بە گەورە تەماشاکردنی خود، کەمکردنەوەی ئەوانی دیکە و مێژووی ئەوی دیکە، لە لایەن ئەوروپییەکانەوە بۆ سەردەمی یۆنانی کۆن دەگەڕێتەوە. ئەوان خۆیان وەك منێکی گەورە، باڵا و سۆپەرمان دەردەخست، ئەوی دیکەی رووخاو، نەزان و ناشارستانی، بە تایبەت ئەمە لە بەرهەمی شاعیر و نووسەرانی ئەو کاتی وەك (ئیلیادەی هۆمەر) و (فارسەکانی ئەخیلیۆس) دەبینرێت. ئەم بۆچوونانە پەیوەندییان هەبووە و هاوکار بوون بۆ داڕشتنەوەی بۆچوونەکانی (هێرۆدۆت)ی مێژوونووس، (ئەسکەندەری مەکدۆنی) و (قەیسەری ڕۆم) کاریان لەسەر کردووە، تا دەگاتە سەدەکانی ناوەڕاست، لەگەڵ دۆزینەوەی جیوگرافی و بازرگانی. بازرگانەکانیش بەردەوام ئەم ئایدیا و بیرکردنەوەیان هەبووە، وەك (مارکۆ پۆلۆ) و دواتر نووسەری مەسیحی (دانتی ئەلگیری).[٤١] بۆیە ئەوەی دەردەکەوێت لەو سەردەمە جیاوازانەدا،

قسەکردن لەسەر ڕۆژهەڵات و خۆ لەوان بە باشتر زانین هەبووە، زانیارییان لە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە کۆکردووەتەوە و وەك سەرەتایەکی ڕۆژهەڵاتناسی ناڕێك و شپرزە بوو، کە مەبەستیان بوو بگەنە ڕۆژهەڵات و ئاڵوگۆڕی زانیاری بکەن.

ئەوەی تائێستا خرایە ڕوو، خوێندنەوەیەکی خێرایە بۆ ئەو مێژووی گەڕان و سەردانانەی ئەوروپییەکان، هەندێك لە بۆچوونەکانیان پێویستە قسەی زیاتری لەبارەوە بکرێت، بۆ ئەوەی زیاتر روون بێتەوە کە مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی لە دێرزەمانەوە دەستیپێکردووەو بە چەند قۆناغێکی یەك لە دوای یەك گەیشتووەتە ئەمڕۆ، نەك لەسەردەمێك و لەماوەیەکی دیارییکراو دەستیپێکردبێت.

## کاری ڕۆژهەڵاتناسی لە دەرکەوتنی ( ئیسلام )ەوە

لەسەردەمی دەرکەوتنی ئیسلام و فتوحاتەکانی بەرەو ناوچەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بیزەتنین و فارسەکان، دواتر ڕۆیشتنی سوپای ئیسلام بەرەو ئەوروپا، دەستیان بەسەر بەشێك لە وڵاتانی ئیسپانیا (ئەندەلوس)، ئیتالیا و فەڕەنسا گرت، بەمەیش ئەوروپییەکان، لە چەندین رەهەندەوە ترسیان بۆ دروستبوو، بۆیە کاتی ئەوە بوو بە خۆیاندا بچنەوەو بەرەنگاری ئەو تەوژمە بکەن کە بە خێرایی بڵاودەبێتەوە، ئەگەر بە زمانی ئەوکات قسە بکرێت، لەو لایەنەوە ئیسلام، ئایینێکە لە لایەن کەسانێکەوە ڕێبەرایەتی دەکرێت، ڕۆحیەتێکی شەیدایی و پەرۆشی و عەشقێکی تایبەتیان بۆ ئایینەکەیان

هەیە، سڵ لە هیچ ناکەنەوە، هـەروەها وەك ئـایینی مەسـیحی خـاوەنی هــەمان پــەیامی خــودایی و کتێبێکــی ئاسمانییــە. ئەمــەش وادەکـات شوێنکەوتووانی ئیسلام وەك شوێنکەوتووانی مەسیحی، ئـایینی خۆیـان بە پیرۆز بزانن‌و بانگەوازی بۆ بکەن، سەرەڕای ئەوەی شـوێنکەوتووانی ئایینـە تازەکـە، زۆرینـەی جومگـە بازرگانییـەکانی نێـوان رۆژهـەلآت و رۆژئاوایـان کـۆنترۆڵ کـردووە، کـە پێـشتر لـە لایـەن مەسـیحییەکانەوە سوودی لێدەبینرا.[٤٢] بۆیە مەسیحییەکانی وڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپا، دەستیان بە لێکۆڵینەوە و پەیداکردنی زانیاری کرد لە بارەی ئەو ئایینە تازەوە، کە بە تەواوی تەنگژەی بۆ بەرژەوەندییەکانی پیاوانی کەنیسە دروستکردبوو.

دەکرێـت بوترێـت، یەکـەم راچـڵەکینی ئـەوروپا و رۆژئاواییــەکان بەرانبەر بە ئایینی ئیسلام، پەرۆشی بۆ زانیاری کۆکردنەوە لەبارەیەوە، لە دوای نامەکەی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) دێـت کە بۆ (هەرقل)، ئیمپراتۆری رۆمەکانی نووسیویەتی[٤٣]، هەروەك تیایـدا هاتووە، پەیامبەری ئیسلام داوای لە هەرقل کردووە بێتـە سـەر ئـایینی ئیسلام و ئایینی خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی پارێزراو بێت.[٤٤] ٨

لــەو نامەیــەدا، بــە تــەواوی پێــچەوانەی ئایــدیا و بیرکردنــەوەی مەسیحییەکانی ئـەوکات بـوو، هەرچـەندە وەك بـاس دەکرێـت، هـەرقل سەرسام بوو بـە نامەکـەی پەیامبـەری ئیـسلام، بـەلآم ئـەوەی بـە لاوە قورس بوو ئایین بگۆڕێـت، ئەمـەش لەبـەر لایـەنی عەقیـدە نـەبووە کـە پەیڕەوکاری مەسیحی بێت، بـەڵکو لەبـەر ئـەوەی کەسـانی دەوروبـەری

ئەوەیان قبولّ نەبوو، لەهەمانکاتدا شتێکی نامۆ بوو بۆ هەرقل، بەو هەموو دەسەڵاتەیەوە کەسێکی نادیار و نەناسراو داوایەکی لەو شێوەی لێ بکات، بلّێت ئایینەکەت بگۆڕە با خۆشبەخت بیت.

لەمەوە هەرقل دەخاتە سەر ئەو رێگایەی زانیاری لەبارەی ئیسلام، شوێنکەوتووان و ئامانجیانەوە بکات، دواتر بەخەلّکە نزیکەکەی بگەیەنێت، هەرقل، دەیان پرسیار دەربارەی ئیسلام و پەیامبەرەکەی لەو کاروانە بازرگانییە عەرەبییانە دەکات کە دێنە ناوچەکەی، ئاشنایەتیان لەگەلّ ئەو ئایینە تازەیەدا هەیە. پرسیارەکانی هەرقل وەك پرسیاری توێژەرێك دەردەکەوێت، زۆر بە وردی ئاڕاستەی دەکات، وەك پرسیار لەسەر کەسایەتی خودی پێغەمبەر، خێزان، هۆز، عەشرەت، رەچەلّەك و نەتەوەکەی، ئەمانە دەکرێت وەك بەدواداچوونێکی کاری رۆژهەڵاتناسی وەربگیرێن.

لەدوای ئەمە و لەگەلّ بەردەوامی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئیسلام و بەریەککەوتنیان لەگەلّ رۆژئاوا، دەستکرا بە گەڕان، پشکنین و بەدواداچوون بۆ ئایینی ئیسلام، تاکو خەلّکی لێ هۆشیار بکرێتەوە، وەك ئەوەی دەیانەوێت. وەك دیارە ئەگەر هەندێك لەوانەی توێژینەوەیان کردبێت، یاخود زانیارییان کۆکردبێتەوە لەسەر ئیسلام، ئەوەندەی هەولّیان داوە وێنەیەکی ناشیرینی ئیسلام پیشان بدەن، نیو هێندە مەبەستیان کاری زانستی نەبوو، ئەمەش لەسەرەتاکانی کاری رۆژهەڵاتیانەدا دەردەکەوێت کە بەم شێوە بووە، نەك لە سەدەکانی دواتردا.

ئەمەش هەر لە نێو دەسەڵاتی ئیسلام و ناوچەکانی ژێر دەسـەڵاتیان کاریان بۆ کردووە، بۆیە هەندێکیش سەرەتای رۆژهەڵاتناسی بۆ ئەوکات دەگێڕنـەوە، وەك بۆچـوونەکانی مێـژوونووس (زیائـەدین سـەردار) کـە (یوحـــەننا دیمەشـــقی، ٧٤٨ ز، مـــردووە)[٤٥]، بـــە دامەزرێنـــەری رۆژهەڵاتناسی ناودەبات، لەبەر ئەوەی یوحەننا، لێکۆڵەرێکی کریستیان (مەسیحی) بووە، هەرچەندە یوحـەننا، هاوڕێیـەکی زۆر نزیکـی خەلیفـە (زەیـد)، خەلیفـەی ئەمەوییـەکان بـوو، بـەڵام بـە دوای دەستخـستنی زانیـاری لـە بـارەی ئیـسلام و خـستنەڕووی بۆچـوونەکانیەوە بـوو، بانگەشـەی ئـەوەی کـردووە ئیـسلام دەبێتـە مەزهـەبێکی بتپەرسـتی و مەککـە و مەدینـە دەبنـە پەرسـتراویان و پێغەمبـەری ئیـسلامی، بـە کەسێکی بێدینی ناوبردووە.[٤٦] قسە و نووسینەکانی یوحەننا، پـڕن لـە سووکایەتی و ناشیرینکردنی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەرەکـەی، ناکرێـت بە کاری زانستی ناوببرێت، بەڵام ئەمە بووەتە سەرچاوەیەکی کۆنی ئەو مەسـیحییانەی کـە لەسـەر ئیـسلام کاریـانکردووە، هـەروەها یوحـەننا، پێیوابووە ئیسلام بەیەکدادانی دەبێت. ئایینێکی تەواو جیاواز دەبێت و جـۆرێتیی ژیانیـان لەگـەڵ ئەوروپاییـەکان جیـاواز دەبێـت.[٤٧] بـەڵام یوحـەننا دیمەشـقی، بـە رۆژهـەڵاتناس دانانرێـت، بـەو پێیـەی یوحـەننا خەڵکی رۆژهەڵات بووەو رۆژئاوایی نەبووە، هـەروەك ئامـاژەی بـۆ کـرا، تەنیا رۆژئاواییەکان بە رۆژهەڵاتناس دادەنرێن، نەك کەسانی رۆژهەڵاتی، هـەروەها ئەوەنـدەی مەبەسـتی دژایـەتی ئـایینێکی دیکـە بـووە، کـە

مەترسی بۆ ئایینەکەی دروستکردووە، ئەوەندە مەبەستی خستنەرووی کاری زانستی نەبووە.

هەروەها ئەلڤارۆس (Alvarus )[٤٨] و هاوڕێکانی، کورتەیەکیان لەسەر ژیانی پێغەمبەری ئیسلام زانیوە و بەدواداچوونی لایەنە جیاوازەکانی ئیسلامیان کردووە، هەندێك لە ڕاهیبەکانی ئیسپانیا، دەربارەی ئیسلام و پەیامبەرەکەی نووسیویانە، لە سەدەکانی هاتنی ئایینی ئیسلامەوە زانیارییان کۆکردووەتەوە.[٤٩]

هەرچی سەردەمی حوکمی موسوڵمانانە لە ئەندەلووس و چەند وڵاتێکی دیکەی ئەورووپا، قۆناغێکی دیکەیە و هەوڵدراوە زانیاری لەسەر ئیسلام بە ناو وڵاتە ئەورووپییەکاندا بڵاوبکرێتەوە، کتێبە ئیسلامییەکان وەربگێڕنە سەر زمانی لاتینی و زمانەکانی دیکەی ئەورووپا، کە بە ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلام، فەلسەفەی ئیسلامی و زانیاری لەسەر قورئان دەستیانپێکردووە، ئەمانە لە وڵاتی ئیتالیاوە، لە لایەن پیاوانی کەنیسەوە هاوکاریی دەکران، چونکە ئیتالیا سەنتەری سەرەکیی مەسیحییەکانە، زۆر نزیکە لە ئاسیا و ئەفریقاوە و تێکەڵبوونی زیاتر لەگەڵ موسوڵمانەکان، هەبوو.

دەکرێت لێرەدا ئاماژە بەوە بکرێت، مافی هەر ئایین و مەزهەب، هەتا پارت و ڕێکخراوێکە بەرگری لە خۆی، ئایدیا و بیرکردنەوەی بکات و هەوڵی سەرکەوتن بدات بەرانبەر ململانێکەرانی، بەڵام سوکایەتی و ناشیرینکردنی بەرانبەر نەبێت، بۆیە ئەوەی بەرانبەر ئایینی ئیسلام و

شوێنکەوتووانی کرا، لەو سەردەمەدا، پڕ بوو لە سووکایەتی و بوختان دروستکردن.

ئەوەی کە هەبوو پەرەی سەند، دواتر شەڕی بەناو خاچدروشمان (حرب الصليبيين)[٥٠] هەوڵ دراوە زیاتر لە بارەی رۆژهەڵات و ئیسلامەوە بزانن و بەدواداچوونی بۆ بکەن، بە تایبەت پیاوە نهێنییەکانی پاپا هەواڵیان گەیاندووەتە پاپا، لە بارەی مەغۆلەکانەوە.

هەروەها گەشتەکەی (مارکۆ پۆلۆ)، لە نێوان ساڵانی (١٢٧١ــ١٢٩٥ ز) سەرەتایەکی باشی پێدان بۆ زانیاری لەسەر دونیای دەرەوەی کریستیانی (مەسیحی)، بۆیە بە پێویستیان زانی، کە هەرچی زووە دەزگا و ناوەندە رۆشنبیرییەکان ببەنە ئەو وڵاتانە، تاکو وەك کاری مژدەبەخشی (موبەشیری) دەستبەکاربن.

هەروەها بۆچوونێکی دیکە بۆ سەردەمی شەڕی بەناو خاچدروشمان (حرب الصليبيين) یان کرۆسەید (CRUSADE) دەگەڕێتەوە، چونکە لە دوای شکستی مەسیحییەکان لەو شەڕەدا، بیریان لە رێگە چارەیەکی تر کردەوە بۆ بەرەنگاری ئیسلام، هەروەك (لویسی نۆیەم) پاشای فەڕەنسا، داوای لە رۆژئاواییەکان کرد بە قەڵەم رووبەڕووی ئەو موسڵمانانە ببنەوە کە شەڕیان لەگەڵ دەکەن، دواتر توانیان چەندین لق لە زانکۆکان بکەنەوە دەربارەی خوێندنی رۆژهەڵاتی، لەم رێگەوە توانیان سەرکەوتووبن، گرێکوێرەیان بەرانبەر ئیسلام و هەم رۆژهەڵاتیش بکەنەوە.

لە سەردەمێکی دواتر و لەکاتی بەستنی کۆنگرەی ڤییەنا، توانیـان هەنگاوێکی زیاتر بنێن، بۆ گەیشتن بـە مەبەسـتیان، بـە تایبـەت کاتێـك (رۆجەر باکۆن)، داوا لە مەسیحییەکان دەکات، پێویستە ئـارام بگـرن و لەژێر چاودێریی کەنیسە لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام بکرێت، بە شێوەیەك شـوێنکەوتووانی ئیـسلام تێبگەیـەنرێت کـە ئایینەکـەیان هەڵەیـە، لـە بەرانبەردا سەرنجیان بۆ لای ئایینی مەسیحی وەك ئایینێکی دروسـتتر و راسـتتر رابکێـشن، لەمـەوە کەنیـسەی خـستە سـەر رێگـە بـۆ بەسـتنی کۆنگرەیەك، تاکو ئەو کاتەی کۆنگرەی ڤییەنا لـە سـاڵی (١٢١٣ ز)، بـە سەرپەرشتی ئەنجومەنی کەنیسا بەستراو تیایدا بڕیـار درا، خوێنـدن بـە زمـانی عـەرەبی و زمانـەکانی دیکـە لـە زانکـۆ جیاوازەکـانی ئـەوروپا دەستپێبکات.[٥١]

لــە ســـەدەی چـواردەیەم و پازدەیــەم، تــا ڕادەیــەك هاوکێـشەی ڕووبەڕووبوونەوەکان، هەوڵی زاڵبـوون و هـەژموون بـە سـەر بەرانبـەردا گۆڕا، چونکە لە ئەوروپا رێنیسانس دەستپێکرد، ئەمەیش سـەرەتایەك بوو بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئایینی مەسـیحی و پیـاوانی سـەر بـەو ئایینە لە ئەوروپا، خەڵکی زیاتر پشتی بە لایەنی زانستی دەبەسـت، بـە هـۆی ئـەو رۆڵـە خراپـەی کاربەدەسـتانی کەنیـسەوە، کـە بـە تـەواوی دەسـتیان خـستبووە ژیـانی خـەڵکی و تەنانـەت هـەوڵی رێگرییـان لـە شــێوەی بیرکردنـــەوەی خـــەڵکی دەکـــرد و دەیانویـــست تـــەنیا شوێنکەوتووانی ئایینی مەسیحی وەلائیان بـۆ ئـەوان هـەبێت، بـەڵام بـە سەرهەڵدانی رێنیسانس لە ئیتالیا و بڵاوبوونـەوەی جوڵـە زانـستییەکان

بەرەو وڵاتانی دیکەی ئەورووپا، کۆتایی بەو جۆرە بیرکردنەوانە هێنا، کاتی ئەوە هات بەرەو وڵاتانی دیکە زیاتر بکرێنەوە، بۆیە بەرەو کیشوەری ئاسیا و ئەفریقا دەستیانپێکرد.

لە دوای ئەم قۆناغە، سەرەتاکانی ریفۆرمی ئایینی دەستیپێکرد و لە جیهانی ئیسلامیشدا چەند گۆڕانێك ڕوویاندا، بۆ وێنە حکومڕانی و دەسەڵات کەوتنە دەست بنەماڵەی عوسمانییەکان، بەمەیش دەسەڵات لە بنەماڵە و نەژادی عەرەبەوە کەوتە دەست تورکەکان، هەروەها هاتنی بە کۆمەڵی جولەکەکان لە ئیسپانیاوە بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان، لەمەیش گرنگتر دەرکردنی موسوڵمانانی غەرناتە بوو، لە سەدەی پازدەیەمدا، ئەم چاخەیش سەردەمی ململانێ و بەیەکدادانی سەربازیی بوو، لە نێوان هەر دوو جیهانی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا، بۆیە نێوانی عوسمانی و ئەورووپییەکان بەردەوام بەرەو خراپیی دەچوو. هەروەك ساڵانی (١٣٥٠ ز) شەڕی نێوان عوسمانی و ئەورووپییەکان لە بەڵکان، گەیشتە ئاستێکی توندو ئاڵۆز، هەروەها سەدەیەك دواتر سوڵتان محەممەد فاتیح (١٤٥٣ ز) توانی لە دڵی ئیمپراتۆری رۆمەکانی رۆژهەڵات (بێزەنتین) بدات، پایتەختەکەیان قوستەنتین پۆل (ئەستەنبوڵ)ی خستە ژێر دەسەڵاتیەوە، کە چەند سەدەیەك جێگەی ناکۆکی هەردوو لایەنی ئایینی مەسیحی و ئیسلام بوو، ئەو شەڕەی مەسیحییەکان نەیاندەویست بۆ وەدەستخستنی ئامانجیان تووشی ببن، بە ناچار ملی گرتنەوە، چونکە ئەوان دەیانویست بە بێئەوەی موسوڵمانەکان بەئاگا بێنەوە، لایەنی فیکری و بیرکردنەوەیان گۆڕانی

بەسەردا بێت، هەروەها لە دەیەی دووەمی سەدەی شازدەیەم، سوڵتان سەلیمی یەکەم، زۆرینەی بەشی هەنگاریای گرت و دەوروبەری شاری (ڤیەننا)ی تەوقدا، بەڵام نەیتوانی ئەو شارە بگرێت، لەمەوە جۆرە مامەڵەیەکی دیکە هاتە کایەوە، کە ململانێکان لە ئایینەوە گۆڕا بۆ سیاسەت.(٥٢)

لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەیەم و سەرەتایی سەدەی حەڤدەیەم، دەوڵەتی عوسمانی وردەوردە لە ڕۆیشتن بەرەو ئەوروپا وەستا، هەنگاونان بۆ دواوە و پووکانەوە دەستیپێکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا لەدەستدانی بەشێك لەو شوێنانەی دەستی بە سەردا گرتبوون و ئیمپراتۆرەکەیان بەرەو دابەشبوون و داتەپین دەچوو، بە جۆرێك بەرەو لێواری داڕووخان دەچوو، کە هیوای هەستانەوەی زۆر کەم بوو.

ئەو لاوازیەی کە بەسەر ئیمپراتۆردا هاتبوو چەند هۆکارێکی هەبوو، لەوانە: سوڵتان و کاربەدەستانی ئیمپراتۆری عوسمانی، بە ژیانی تایبەتیی خۆیانەوە خەریك بوون، زوڵم و ستەمیان بەرانبەر خەڵکی گەیشتە ئاستێکی بەرز وەك، وەرگرتنی باج و سەرانە و بێبەشکردنی ناوچەکان لە خزمەتگوزاری، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوروپییەکان بەرەو جیهانی ئیسلام زیاتر دەڕۆیشتن و تادەهات کاری خۆیان دەکرد، ئەوەش لە رێگەی کردنەوەی چەندین ناوەندی پەروەردەیی ئەوروپایی، لەسەر خاکی ئیمپراتۆری عوسمانی.(٥٣) بۆیە رۆژئاواییەکان تا دەهات هەژموونیان بە سەر ولاتانی ژێر دەسەلاتی عوسمانیدا زیادی دەکرد،

تەنانەت دەبوونە هاوکاری ئەو دامەزراوە، بزوتنەوە و جوڵانەوانەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان کە دژی ئیمپراتۆری عوسمانییەکان بوون، وەك شۆڕشی محەممەد عەلی لە میسر لە سەدەی نۆزدەیەم.

لە لایەکی دیکەوە تا دەهات کۆمەڵە و دامەزراوە ئەوروپی و ڕۆژئاواییەکانی تایبەت بە ئیسلام لە زیادبوونـدابوون، هەروەك لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، دەیان کۆمەڵە و دەزگای تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی دامەزران، زانکۆکان کورسی تایبەتیان بۆ لێکۆڵینەی ڕۆژهەڵات تەرخان کرد، لە لایەکی دیکەوە دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، هەنگاویان بەرەو داگیرکردنی ڕۆژهەڵات دەنا، ئەمەیش بە هاوکاریی ڕۆژهەڵاتناسان دەستیانپێکرد، هەر چی ڕۆڵی بیرمەند و فەیلەسووفانی ئەوروپی و ڕۆژئاواییە، بۆ پشتگیری بیر و ئایدیای ڕۆژهەڵاتناسان نابێت لەبیر بکرێت.

## ڕێکخستن و بەدامەزراوەکردنی کاری ڕۆژهەڵاتناسی

پێشتر کورتەیەك لەسەر مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی و ئاشنابوونی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەیەکتر باسکرا، هاوکات باسی ئەوەشکرا کە ئەو جۆرە خوێندنەوە و شیکردنەوانەی بەرانبەر یەکتر هەبووە بەشێوەی ڕێکخراوەی و مەبەستدار نەبوو، کە لەشێوەی دەزگاو ناوەندی بەرنامە بۆ دانراو بە هەر ئامانجێك بێت کار بکات، بەڵام ئەگەر باس لە بەدامەزراوەکردنی کاری ڕۆژهەڵاتناسی لە زانکۆکان، کردنەوەی لق، ناوەندی ئەکادیمی و کۆمەڵەکان بکرێت، ئەوا سەردەمی حوکمی

موسوڵمانان له ئەندەلووس (ئیسپانیا)، وەك ئەو مێژووە دادەنرێت و دەستپێدەكات، بەو پێیەی حوكمی موسوڵمانەكان له (ئەندەلووس) له سەدەكانی (١١، ١٢ و ١٣ ز) سەرەتای رۆژهەڵاتناسییە، كه تیایدا چەندین ڕاهیب و قەشەی مەسیحی، كتێب و نووسراوی موسوڵمانەكانیان وەرگێڕایه سەر زمانی وڵاته ئەوروپییەكان، له زانكۆكان لقی تایبەت بەو بوارەیان كردووەتەوە، وەك كارەكانی جربرت دی ئۆرلیاك (٩٣٨ـ١٠٠٣ ز)، له ئەندەلووس دەستیپێكردووە، ئۆرلیاك سەرەتا له شاری (ئیشبیلیه و قورتوبه)، وانەی خوێندووە، دواتر بووەته زانایەكی گەورەی سەردەمەكەی خۆی له ئەوروپا، وه سەرقاڵی كاری تایبەت به دونیای رۆشنبیریی عەرەبی، ماتماتیك و گەردووناسی، بووە.[٥٤]

لەو كاتەوە به شێوەیەكی دامەزراو و پلان بۆ دانراو، دەستكرا به وەرگێڕان و كۆكردنەوەی بەرهەمەكانی ئایینی ئیسلام، له قۆناغێكی گەشەكردووتردا و دوای شەڕی خاچدروشمان، هەروەك هەندێك له لێكۆڵەران ئەو مێژووە دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی شەڕی خاچدروشمان كه زیاتر له دوو سەدە بەردەوام بووە، شەڕەكه له بەرژەوەندی موسوڵمانان كۆتاییهات، به تایبەت سەردەمی (لویسی نۆیەم)، دوای تێشكاندنیان له شەڕی (دیمیات، ١٢٥٠ ز) و نائومێدبوونی لویسی نۆیەم له شەڕ، بۆ ئەوەی قەرەبووی شكستەكەیان بكاتەوە، وتی: "با ئیدی دەستبدەینه شەڕی وشه و وته، چونكه ئەم جەنگه دەتوانێت موسوڵمانەكان بشكێنێت".[٥٥]

قسەکانی لویسی نۆیەم و شکستەکەیان بووە سەرەتایەك بۆ کاری زیاتری رۆژهەڵاتناسی و وانەیەك کە چیتر نەوەستن بۆ سەرکەوتن بەسەر دەسەڵاتی موسڵمانانداو تۆڵەکردنەوەی شکستەکانیان، لە دوای ئەم قۆناغە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دیکەی رۆژئاوا دەستیپێکرد، دەکرێت بوترێت قۆناغێکی سەرکەوتوو بوو بۆ هەڵگرانی ئاینی مەسیحی و ئەوانەی بە کاری مژدەبەخشی (موبەشیر)یەوە خەریکبوون، چونکە توانیان بڕۆنە ناو رۆژهەڵات و جیهانی ئیسلامی و دەست بە زانیاری کۆکردنەوە و توێژینەوە بکەن.

بۆچوونێکی تر سەرەتای کاری رۆژهەڵاتناسی دەگێڕنەوە بۆ کۆنگرەی ڤیەننا لە ساڵی (١٣١٢ ز) کە ئەو کات لەو گۆنگرەدا بڕیاری دامەزراندنی چەندین لق و پەیمانگا بۆ لێکۆڵینەوەی تایبەت بە رۆژهەڵات درا.

بەڵام دکتۆر موحسین محەممەد حەسەن مێژوونووسی کورد، پێیوایە ئەو قۆناغانەی وەك سەرەتای مێژووی رۆژهەڵاتناسی باس دەکرێن، هیچیان ڕاست نیین، چونکە رۆژهەڵاتناسی پرۆسەیەکی رۆشنبیری و لێکۆڵینەوەیە کە لەسەردەمی ڕۆشنگەری وەك سەرەتایەك دادەنرێت، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی ئایینی لاواز بوو، بۆیە لە سەدەی نۆزدەیەمەوە، رۆژهەڵاتناسی دەستپێدەکات.[٥٦]

پێویستە ئەو بۆچوونەی مێژوونووس دکتۆر محەممەد دسوقی وەك لە کتێبی (سیر تاریخی و ارزیابی اندیشه شرق شناسی)دا هاتووە

بخەینەڕوو، کە پێیوایە کارو مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی لەسەردەمی حوکمی موسوڵمانان لە ئەندەلووس دەستپێدەکات و تا ئێستا بەردەوامە، بە چەند قۆناغ گەشەی کردووە تا ئەمڕۆ، هەروەك پێیوایە، قۆناغی یەکەم سەردەمی حوکمی موسوڵمانانە لە ئەندەلووس، قۆناغی دووەم شەڕی خاچدروشمان (حرب الصليبيين) لە ماوەی دوو سەدەدا و قۆناغی سێیەمیش، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەم هەتاکو جەنگی دووەمی جیهانیی بەردەوامە، کە لەو جەنگەوە تا ئێستا ـ سەدەی ٢١ـ قۆناغێکی دیکە و کۆتا قۆناغی ڕۆژهەڵاتناسییە، کە ئەم قۆناغە ترسناکترین قۆناغی ڕۆژهەڵاتناسییە.(٥٧)

ئەوەی دسوقی باسی دەکات، باشی پێکاوە، وەك قۆناغەکانی بەدامەزراوەکردنو زانستییکردنو ڕێکخراوەی کاری ڕۆژهەڵاتناسی بۆچوونێکی لە هەموویان گونجاوترە، لەبەر ئەوەی پرۆسەیەکە بە چەند قۆناغ بەردەوام بووە، نەك فیکرە و ئایدیایەك بێت لە ماوەیەکی دیارییکراو سەریهەڵدابێت، بەڵام هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، ڕۆژهەڵاتناسی و کار و چالاکی ڕۆژهەڵاتناسی لەسەردەمی یۆنانەکانەوە، بە شێوەی ناڕێکوپێك و ناڕێکخراو دەستپێدەکات، بە چەند قۆناغێك تا دەگاتە دامەزراندنی پەیمانگا و لقی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی لە زانکۆکاندا، کە وەك زانست دەناسرێت.

## دامەزراوە و پەیمانگا ڕۆژهەڵاتناسییەکان

بەدامەزراوەکردن و ڕێکخستنی کاری ڕۆژهەڵاتناسی و کردنەوەی لق و ناوەندی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی، بە چەند قۆناغێك گەشەی کرد، بەڵام وەرگێڕانی تایبەت بەم بوارە و پشتگیری دەوڵەتانی ئەوروپا بۆ توێژەر و گەڕیدە و ڕۆژهەڵاتناسەکانیان بۆ سەردەمی دەسەڵاتی موسوڵمانان لە ئەندەلووس دەگەڕێتەوە، ئەو کات بە پشتیوانی پاپای ڤاتیکان و قەشە و ڕاهیبەکان و کەسە ئایینییەکان دەستکرا بە کۆمەڵێك کار، وەك وەرگێڕانی قورئان و ئەو کتێبانەی لەسەر ژیانی پێغەمبەری ئیسلام، کتێبەکانی تایبەت بە شەریعەت، پزیشکی و فەلسەفەی ئیسلام نووسرابوون. هەروەها بەدواداچوونی هەندێك لەو ڕاهیبانەی کە هاتبوونە ئەندەلووس و کاریان دەکرد، لەوانە (بوترس ئەلموحتەرەم)، لە ساڵی (١٩٠٣ـ١١٥٦ زایینی)، (جیرار دی کریمون) لە ساڵی (١١١٤ـ١١٨٧ ز)، ئەمانە لە ئەندەلووس ژیاون و توێژینەوەیان لەبارەی ئیسلامەوە کردووە، هەروەها دوای کۆنگرەی ڤیەننا (١٣١٢ ز)، چەندین ناوەندی ئەکادیمی تایبەت بە بواری ڕۆژهەڵاتناسی بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕۆژهەڵات کراوەتەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا چەند زانکۆیەکی ئەوروپی، کۆرسی تایبەت بە فێربوونی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان، لە زانکۆکانی (کامبریج)، (سلامنکا) و (پۆلۆنیا) و چەند زانکۆیەکی دیکە کردەوە، بەڵام لە سەدەی هەژدەیەم و سەردەمی هاتنی کۆلۆنیالەکانی ئەوروپا بەرەو وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا، کار و مەوداکانی ڕۆژهەڵاتناسی بە تەواوی فراوان بووەو رووخسارێکی دیکەی لەخۆگرت هاوکات

ئەرکیشیان جیاواز بوو، بەو پێیەی لەو سەدەیەدا وڵاتانی ئەوروپا کەوتنە پێشبڕکێ و ململانێ بۆ زوو گەیشتنە ئاسیا، بە تایبەت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە مەبەستی دەست بەسەردا گرتنی ئەو ناوچەیە.

گەیشتن بە ڕۆژهەڵات، خەونی زۆرێك لە گەورەکانی ئەوروپا بوو، وەك ئەو ململانێیەی لە نێوان هۆڵەندی، پرتوگالی، فەڕەنسی و بەریتانییەکاندا هەبوو، بۆ داگیرکردنی وڵاتی هیندستان و وڵاتە عەرەبییەکانی هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەفریقا.

لەوێوە زۆرترین کار بۆ ئەو مەبەستە کرا، بە تایبەت بۆ تێگەیشتن لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆژهەڵات و تێکەڵبوون بە کەلتوور و ڕۆشنبیری و لایەنەکانی دیکەی ژیانی ئەوان (ڕۆژهەڵات)، بە تایبەت لە لایەن وڵاتانی بەریتانیا و فەڕەنسا. هەروەك لە ساڵی (١٧٣٤ ز) جۆرج سیلی ئینگلیزی، قورئانی بە زمانی ئینگلیزی وەرگێڕا، هەروەها ساڵی (١٧٥٩ ز)، ئینکتیل دوپرنی فەرەنسی، کتێبی پیرۆزی ئایینی زەردەشتی (ئاوێستا) ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەڕەنسی، بە هەمان شێوە لە ساڵی (١٧٩٥ ز)، قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان کراوەتەوە و لە ساڵی (١٨٠٤ ز)، لە شارەکانی خارکیف و کازانی ڕوسی کۆرسی زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی کراوەتەوە، هەروەها لە ساڵی (١٧٧٩ز)، زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسی لە زمانی ئینگلیزیدا بەکارهێنا، لە ساڵی (١٧٩٩ ز)، لە زمانی فەرەنسیدا بەکارهێنرا و لە ساڵی (١٨٣٨ ز) زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسی شێوەیەکی ڕەسمیی وەرگرت.[٥٨]

سـەبارەت بـە کۆمەڵـەو گرووپـە ڕۆژهەڵاتناسـییەکانیش چـەندین کۆمەڵـە دامـەزرا، وڵاتـی بـەریتانیا، ساڵی (١٨٢٣ زایینـی) لـە لەنـدەن (کۆمەڵـەی لێکۆڵێنـەوەی ڕۆژهـەڵات)ی دامەزرانـد، هەرچـی وڵاتـی ئەمریکایە، لە ساڵی (١٨٤٢ ز) (کۆمەڵـەی ڕۆژهەڵاتناسانی ئـەمریکا)ی دامەزراند.[٥٩]

## گۆڤار و بڵاوکراوەکان وەك گەیاندنی پەیامی ڕۆژهەڵاتناسی

لە سەدەی نۆزدەیەم و لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵـە و پـەیمانگاکانی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی، چـەندین بڵاوکـراوە و پـەخش دەرچـوون کـە زیـاتر خزمـەتیان بـە ئایـدیا و فیکـرەی ڕۆژهەڵاتناسـی و کـاری موژدەبەخشی (موبەشیر)ی مەسیحی دەکرد، زیـاتر کاریگـەریی لەسـەر خەڵکی هەبوو، یەکێك لەو کەسانەی کاری دەکرد (هامر برجشتال) بـوو کە یەکەم گۆڤاری زانستی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتی لە ڤییەنا (١٨٠٩ ز) بـە نـاوی (سەرچـاوەکانی ڕۆژهەڵاتناسـی) دەرکـرد، لـە سـاڵی (١٨٩٥ ز)، گۆڤاری (ئیسلام) تایبەت بە جیهان و کەلتووری ئیـسلامی دەرچـوو[٦٠]. هەروەها گۆڤاری (جیهانی ئیسلامی) لە ئەمریکا، کە بیرۆکـە و ئایـدیای مەسیحییەتی بڵاودەکردەوەو بە شێوەی ئاشکرا سوکایەتی بـە ئـایینی ئیسلام دەکرد.[٦١] نەك کاری توێژینەوەی زانستی و ئەکادیمی.

دواتر چـەندین گۆڤـاری دیکـە بـەم نـاوە بڵاوبـووەوە و گۆڤارەکـانی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی سەدانی تێپەڕاند.

## کورسی خوێندن بۆ ڕۆژهەڵاتناسی

لایەنێکی دیکەی تایبەت بە پەرەپێدانی ڕۆژهەڵاتناسی، دابینکردنی کورسی خوێندن بوو بۆ ئەو خوێندکار و کەسانەی لەسەر ڕۆژهەڵاتناسی دەیانخوێند، هاوکاری و پاڵپشتی ماددی و مەعنەوییان هەبوو، وڵاتانی ئەوروپا لەمەدا جیاوازبوون لەڕووی دابینکردنی کورسی خوێندن و مێژووەکەی، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## وڵاتی بەریتانیا:

بەریتانیا پێشەنگی ئەو وڵاتانە بوو، هەر زوو گرنگی بەم لایەنەدا، وەك ئەو کورسی خوێندنانەی تەرخانی دەکرد، ساڵی (١٦٤٠ ز) ئارك بیشۆپ لۆد، دەستنووسە ڕۆژهەڵاتییەکانی کۆکردەوە، یەکەم کورسی خوێندنی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دامەزراند، بۆ خوێندکارە زیرەکەکان کە ولیەمی سێیەم پشتگیریی دەکردن، دووەم کورسی خوێندنی ڕۆژهەڵاتناسی، لە هەمان زانکۆ ساڵی (١٦٩٩ زایینی) لە لایەن شاژنە (ئانی) تەرخانکرا و پشتگیریی کرد، بۆ ئەم مەبەستە یەکەم کورسی زانکۆی ئۆکسفۆرد، بۆ ئیدوارد پۆکی (١٦٠٤ـ١٦٩١زایینی) تەرخانکرا، کە یەکەم لێکۆڵەری ئەو وڵاتە بوو فێری زمانی عەرەبی بووبوو، دواتر سەردانی چەند وڵاتێکی عەرەبی کرد و (٤٢٠) دەست نووسی بڵاونەکراوەی، لەگەڵ خۆی بۆ کتێبخانەکانی بەریتانیا بردەوە، ئەمانە سەرەڕای هاوکاری بنەڕەتی حکومەت بۆ زووتر گەیشتن بە ئامانج، خەڵات و دیاریشیان پێشکەش دەکردن، وەك ئەوەی جۆرجی یەکەم (٥٠) دۆلاری خەڵاتی ئەو مامۆستا و خوێندکارانەی زانکۆی ئۆکسفۆردی دەکرد کە عەرەبی فێر دەبوون.

هەروەها لە زانکۆی کامبریج لەساڵی (١٦٦٠ زایینی)، یەکەم کورسی بۆ فێرونی زمانی عەرەبی و دواتر زمانی هیبرۆ (عیـبری) تـەرخان کـرد، سریانی و زمانەکانی دیکە کورسیان بۆ تەرخان کـرا، بـە هـەمان شـێوە جۆرجی یەکەم، ئەو برە پارەی بۆ ئەمانیش تەرخانکردووە.

هەر لەو سەدەیەدا، چەندین کورسی دیکە تەرخانکرا بۆ خوێندکاران و فێری زمانی عەرەبی بوون، دواتر هاتنە وڵاتانی عەرەبی و رۆژهـەڵاتی ناوەڕاست، وەك: تۆماس هایدی، جۆن کۆرنیە، تۆماس هۆنت، جۆزیـف وایـت و چـەندانی دیکـە.(٦٢) لـە کۆتاییيـەکانی سـەدەی هەژدەیـەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، ئینگلیزەکان بە تـەواوی لـە هیندسـتان و وڵاتانی دیکەی دەوربـەری باڵادەستبوون، بـە تایبـەت بـە دامەزرانـدنی کۆمپانیـای هینـدی رۆژهـەڵاتی و گەشەسـەندنی کارەکـانی، چـەندین لێکۆڵـەر و گەڕیـدە سـەردانی ئـەو وڵاتـەیان کـرد، دەسـتنووس و دۆکیۆمێنتەکانیان کۆکردەوە و کاریان لەسەر دەکردن.

## وڵاتی فەڕەنسا:

وڵاتـی فەڕەنـسا، شانبەشـانی بـەریتانیا دەسـتی بـە لێکۆڵینـەوە و کارکردن لەسەر رۆژهەڵات، کرد.

لە ساڵی (١٧١٨ز) کۆلیژی (دی فرەنس) بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەکانی سریانی و عیبری، دواتر زمانی عەرەبی، تورکی و فارسی دامـەزرا، ئـەم کۆلێـژە لـە لایـەن دەسـەڵاتە یـەك لـە دوای یەکـەکانی (لویـسەکان)ی فەڕەنساوە هاوکاری و کارئاسانیان بۆ دەکردن.

هـەروەها لـە سـاڵی (١٧٩٥ ز) ئیکـۆلی دیـس لـەنگویج ئۆرێنتـایس ڤیڤـانتس و سیلڤیـستری دی ساسـی، لـە پـاریس دامەزرانـد، لـە سـاڵی (١٨١٤ ز) کۆلێژی (ساسی)، کورسی بۆ خوێندنی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان دامەزراند، یەکەم کورسی بۆ فێربوونی زمانی سانسکریتی، بـۆ (لیۆنـارد دی چیزی) تەرخانکرا.

هـەروەها چـەندین لێکۆڵـەر و گەڕیـدەی فەڕەنـسا نێردرانـە وڵاتـانی ڕۆژهەڵات و هاوکاری دەکران، وەك: ئـەنتۆنیۆ گالانـد، فـازە دو هالـدی، ئـەبراهام هیاسـینتی و چـەندانی دیکـە کـە ئیـشیان لەسـەر بەرهەمـە عەرەبییەکان کردووە و ناوبانگیان هەیە، وەك وەرگێڕانەکانی ئـەنتۆنیۆ گالاند ساڵی (١٧٠٤-١٧٠٨زایینـی)، لـە کتێبـی (هـەزار و یـەك شـەو)ی عەربی وەرگێڕاوە.

دەبێت کارە شکستخواردووەکەی (هێنری چوارەم) پاشای فەڕەنسا بخرێتە ڕوو، کە هەوڵی دا کۆمپانیای فەرەنسی ڕۆژهەڵاتی هیندستان لە سـاڵی (١٦٠٤ ز) دابمـەزرێنێت، بـەڵام ئـەم کـارە بـۆ هێنـری چـوارەم سەرینەگرت. هەروەها هاریکاری و پـشتیوانییەکانی (تـالیران) وەزیـری دەرەوەی فەڕەنـــسا، لـــە حکومەتەکـــەی نـــاپلیۆن پۆناپـــارت، بـــۆ بەهێزکردنی پێگەی وەزارەتی دەرەوەیان لە سـاڵی (١٨٠٥ زایینـی)دا و چەندین هاوکاریی پێشکەش ئەو کەسـانە دەکـرد کـە هـەوڵی فێربـوونی زمانی عەرەبیان دەدا،[٦٣] بەشـێکن لـە هەوڵـەکانی وڵاتـی فەڕەنـسا بـۆ ڕۆژهەڵاتناسی.

## وڵاتی ئەڵمانیا:

هەرچـی وڵاتـی ئەڵمانیایـە دەسـتی بـە دامەزرانـدنی پـەیمانگا و قوتابخانـەی تایبـەت بـە ڕۆژهەڵاتناسـی، کـرد، بـەڵام دەسـتپێکردن و هەوڵەکانی وڵاتی ئەڵمانیا، لەم لایەنەوە درەنگتر بوو، راسـتە لێکۆڵـەرە ئەڵمانییـەکانیش لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی هەژدەیەمـەوە و سـەرەتای سەدەی نۆزدەیەم دەستیان بە لێکۆڵینـەوە کـرد، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی وڵاتێکی داگیرکەر نەبوو، هەروەها خوێندکارەکانیان زیـاتر لـە وڵاتێکـی وەك فەڕەنـسا لـە بـارەی ڕۆژهەڵاتـەوە دەیانخوێنـد، بۆیـە جیاوازییـەك هەبوو، زۆرێك لەو خوێندکارانەی ئارەزووی توێژینەوە و نووسـینیان لـە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە هەبوو دەچوونە وڵاتی فەڕەنسا، بە تایبەت کۆلیژی (ساسی) و دواتر دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکـەیان بـۆ کـارکردن تایبـەت بـەم بوارەدا، لەوانە جۆرج ویلهیم فریتاج، گۆستاڤ فلۆجیل، ئەبراهام جیەجیر و چەندین خوێنـدکاری دیکـە توێژینـەوەیان لەسـەر ڕۆژهـەڵات دەکـرد. بەشێکی زۆر لەم توێژەرانە لە بارەی ئیسلامەوە توێژینەوەیان دەکـرد، بەڵام یەکەم پەیمانگای تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی لەو وڵاتـەدا، لـە سـاڵی (١٨٤٥ زایینـی) بـە نـاوی (کۆمەڵـەی ڕۆژهـەڵاتی ئـەڵمانی) لـە لایـەن کۆمـەڵێك ڕۆژهەڵاتناسـەوە دامـەزرا. هـەروەها لـە سـاڵی (١٨٨٧ ز)، چەندین سیمینار بۆ زمانـەکانی ڕۆژهـەڵات بەڕێوەچـوو، دواتـر چـەندین کتێب و توێژینەوەیان بڵاوکردەوە، بەڵام یەکەم کورسی بۆ خوێنـدن لـە ساڵی (١٩٠٨ ز) لە هامبۆرگ تەرخانکرا.[٦٤]

جگـە لـەو وڵاتانـەی باسـکران وڵاتـانی دیکـەی ڕۆژئـاوا، چـەندین دامەزراوە و پەیمانگایان بۆ لێکۆڵینەوەی تایبەت بە ڕۆژهەڵات دامەزراند و دەیـان و سـەدان توێـژەر و لێکۆڵـەری ئـەو وڵاتانـە توێژینـەوەو لێکۆڵینـەوەیان ئـەنجام داوە، لێـرەدا تـەنیا چـەند نموونەیـەکیان باسـدەکرێت، لەوانـە: ڕۆژهەڵاتناسـی (هۆڵەنـدی)، تۆمـاس ئێرپینـۆس (١٥٨٤-١٦٢٤ ز)، لەسـەر ڕێزمـانی عـەرەبی چـەندین بەرهـەمی بڵاوکردووەتەوە، هەروەها وڵاتی (هـەنگاریا)ش چـەندین ڕۆژهەڵاتناسـی هەبووەو لێکۆلێنەوەیان ئـەنجام داوە، لەوانـە جۆنـاس ئـۆری، چـەندین دەستنووسی بڵاوکردووەتەوە.

لە وڵاتی (ڕووسیا)یش، بە شێوەیەکی ورد کاریـان لەسـەر ڕۆژهـەڵات کردووە و جێدەستیان دیارە، یەکەم کورسی بۆ خوێندنی ڕۆژهـەڵات لـە ساڵی (١٨٠٤ ز)، لە مۆسکۆ دامـەزراوە، هـەروەها یەکـەم بەشـی زمانـە ڕۆژهەڵاتییەکان لـە سـاڵی (١٨٣٥ زایینـی) بـە شـێوەیەکی ئـەکادیمی و زانستی بـووە، بـەڵام دواتـر هـەموو زانکـۆ ڕووسـییەکان گرنگییـان بـە خوێندنی زمان و بنەماکانی ئیسلام داوە.

سەبارەت بە کاری هاوبەش لە نێوان وڵاتانی ئـەوروپا و ڕۆژئـاوا، بـە شـێوەیەکی هەماهـەنگی لـە نێـوان ڕۆژهەڵاتناسـەکان و لـە کـارێکی هاوبەشدا (ئینـسایکلۆپیدیای ئیـسلام)یـان دەرکـرد، بـەڵام لەلایـەن دوو ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیەوە سەرپەرشتی دەکرا، ئەوانیش (ئەرسەر سکۆدی)

و (ڕیچارد هارتمان) بوون کە یەکەم بەرگی لە ساڵی (١٩١٣ ز) بڵاوکراوەتەوە و دووەم بەرگی لە ساڵی (١٩٢٧ ز) بڵاوکراوەتەوە.[٦٥]

دواتریش لە کاتی هەردوو جەنگە گەورەکەی جیهان، کاری ڕۆژهەڵاتناسی گەیشتە لوتکە و شوێنێك و لایەنێکی ژیانی تایبەت بە ڕۆژهەڵات نەما بوو کاری لەسەر نەکەن و زانیاریشی لەسەر کۆنەکەنەوە، بەڵام لە دوای جەنگی جیهانیی دووەم کاری ڕۆژهەڵاتناسی گۆڕانی بەسەرداهات، بە هۆی سەربەخۆیی وڵاتانی ڕۆژهەڵات و پاشەکشێی وڵاتە کۆلۆنیالەکانی ئەوروپا، گواستنەوەی دەسەڵاتی یەکەم و هەژموونی دەسەڵات لە جیهان، بە تایبەت لە ئاسیادا، لە بەریتانیاوە بۆ ئەمریکا گۆڕانی بەسەرداهات، دواتر دەستپێکردنی (شەڕی سارد) لە نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات بە سەرۆکایەتی رووسیا و بلۆکی ڕۆژئاوا بە سەرۆکایەتی ئەمریکا، دەسەڵاتی ڕۆژئاواییەکانی لە ڕۆژهەڵات کەمکردەوە.

هەروەها بەستنی چەند کۆنگرەیەك لە ئەوروپا، تایبەت بە کاری ڕۆژهەڵاتناسی وایکرد، کارکردن لەم مەودایەدا گۆڕانی بەسەردا بێتو کۆنفرانس و کۆنگرەکانی ئەم لایەنە بڕیاری لە داهاتووی کاری ڕۆژهەڵاتناسی و ئامانجەکانی و شێوەی کارکردنی دەدا.

## کۆنگرەکانی تایبەت بە رۆژهەڵاتناسی

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم، بۆ زیاتر رێکخستنی کاری رۆژهەڵاتناسی و گەیشتن بە ئامانجەکانیان لە وڵاتی فەرەنسا، ساڵی (١٨٧٣ ز) یەکەم کۆنگرەیان لەسەر رۆژهەڵاتناسی بەست، ئەمە وەك سەرەتای کاری ڕۆژهەڵاناسی فەرمی دادەنرێت. لەو کۆنگرەدا زۆرێك لەو وڵاتانەی ئەوروپا و بە تایبەت ئەو وڵاتانەی (رۆژهەڵاتناس)یان هەبوو بۆ رێکخستنی زیاتری کاری رۆژهەڵاتناسی و ئەو لایەنانەی کە بڕیاری لەسەر دەدرا کاری بۆ بکەن، پێکەوە کۆ دەبوونەوە.

دوای کۆنگرەکەی پاریس، (٣٠) کۆنگرەی نێودەوڵەتیی دیکەیان لە وڵاتانی ئەوروپا بەست، هەرچەندە پێشتر کۆنگرەی بچووکتر و نێوخۆیی لە چەند وڵات بەسترابوو، وەك کۆنگرەی شاری (درسدن، ١٨٤٩ ز) بەسترا.

لەو کۆنگرە نێودەوڵەتییانە سەدان زانکۆ، هەزاران زانا، رۆژهەڵاتناس و گەڕیدە بەشداریی دەکرد، بەرنامە و پلانی کارکردنیان دادەنا.[٦٦]

یەکێکی دیکە لەو کۆنگرە گرنگانەی لە سەدەی بیست بەسترا، کە وەك یادی سەد ساڵەی، یەکەم کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی و هەم کاری لەسەر داهاتووی ڕۆژهەڵاتناسی دەکرد و تیایدا سەدان رۆژهەڵاتناس و گەڕیدە و توێژەری ئەورووپی بەشداری بوون، تیایدا ناوی رۆژهەڵاتناسیان گۆڕی، ئەویش (کۆنگرەی پاریس) بوو کە لە ساڵی (١٩٧٣ ز)دا بەسترا، هەر لە کۆنگرەکەدا زاراوەی رۆژهەڵاتناسی بۆ

(کۆنگرەی جیهانی بۆ توێژینەوە لـە ئاسـیا و بـاکووری ئـەفریقا) گـۆڕا. (٦٧)

ئەمەش دیارە هەنگاوێکی دیکەیە بۆ دەرچوون لەو تێڕوانینەی کە بۆ ڕۆژهەڵاتناسـەکان هـەبوو، لـە لایـەن خـەڵکی ڕۆژهـەڵاتو بەشـێك لـە ئەورووپاییەکان، چونکە ئاگاداربوون لـەوەی کـە ڕۆژهەڵاتناسـەکان ڕق و کین و بێزراوییان هەبوو بەرانبەر بە جیهانی ئیسلامی.

هەروەك بێرنارد لویس ئەو ڕاستییەی خستوەتەڕوو کە لە ئێستا بـە دواوە ـ دیارە قسەکانی بەرنارد لویس بۆ کاتی گۆنگرەکە دەگەڕێتەوە- کار و مانای ڕۆژهەڵاتناسی خراپ بـووە و مانـا و تێگەیـشتنێکی خراپـی هەیە و کۆنگرە کاتێکی باشە بـۆ چاوخـشاندنەوە بـە ئـەرك و فـەرمانی ڕۆژهەڵاتناسـی، بۆیـە بـە زۆرینـەی دەنـگ لەگـەڵ گـۆڕینی ناوەکـەی بوون. (٦٨)

دوای ئـەم کـۆنگرە چـەند کۆنگرەیـەکی دیکـە لـە سـاڵانی دواتـر و نـەوەدەکانی سـەدەی ڕابـردوو بەسـترا و جـۆرێکی دیکـە لـە کـاری ڕۆژهەڵاتناســی هاتەکایــەوە، بــە تایبــەت دوای هێرشــەکەی (١١ سێپتەمبەری ٢٠٠١ ز)، بۆ سەر دوو تاوەرە بازرگانییەکـەی ئـەمریکا لـە شـاری نیویـۆرك، کـە زیـاتر ئـەو بـوارە لـە دەرکردنـی بڵاوکراوەکـان، کەناڵـەکانی تەلـەفزیۆنی و ئینتەرنێتـەوە و کـاری کارتۆنییـەوە خـۆی دەبینیەوە و بەردەوامن لە کاری ڕۆژهەڵاتناسی.

# ئەنجام

ـــ بۆچـوونەکان لـە بـارەی پێناسـە، مێـژوو، جیوگرافیـا و کـاری ڕۆژهەڵاتناسـییەوە جیـاوازن، تائێـستا بۆچـوونێکی کـۆنکرێتی و سەرەتایەکی دیارییکراویان نییە بۆ دەستپێکردنی ڕۆژهەڵاتناسی، بەڵام پرۆسەیەکە لەسەردەمی یۆنانەکانەوە بە شێوەی پچڕ پچڕ و نـاڕێکخراو بەردەوامیی هەیە و لە چەند قۆناغێك پێکدێت.

ـــ لـە هەڵسەنگاندی ڕۆژهەڵاتناسـان، ناکرێـت بـە چـاوێك تەماشـای کارەکانیـان بکرێـت، چـونکە بەشـێکیان تـەنیا هـەوڵی ناشـیرینکردنی ڕۆژهـەڵات و جیهـانی ئیـسلامییان داوە، بـەڵام بەشـێکی دیکـە لـەو ڕۆژهەڵاتناسـانەی کـە لێکۆڵینـەوەیان دەکـرد، بەوپـەڕی زانـستییانە و ئەمانەتـەوە زانیـاری و داتاکانیـان دەگواسـتەوە، کـە ئـەوان نەبوونایـە سەدان و هەزاران بەڵگەنامە، دۆکیۆمێنتی ڕۆژهەڵات و وڵاتانی ئیـسلامی لەناودەچوون، ئەوان لە ویژدانێکی ساغ و بەسۆز و ئازایەتییەکی بێوێنە کاریان دەکـرد، ئـەوان گوێیـان بـە ڕەخنـە و گازنـدە و تـەماح و پـووڵی وڵاتانیان نەبوو، بەڵکو کـاری زانـستی و دانـشمەندیی لـە پـێش هـەموو شتێکەوە بوو.

ـ رۆژهەڵاتناسی، لە پەیوەندیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا، فۆڕم و شێوازێکی نوێی هێنایە بەرهەم، لە دونیایەکی شەڕ و پێکدادان، بۆ دونیایەکی زانست و ململانێی مەعریفی گۆڕا.

ـ هەرچەندە لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو، ناوی رۆژهەڵاتناسی گۆڕاوە، بەڵام فیکرەی رۆژهەڵاتناسی تا ئێستا هەیە و بەردەوامە، کە هەندێکیان هۆکارێك بوون بۆ بە کەم سەیرکردنی رۆژهەڵات.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

1. A.L.. Macfie: Orientalism, first publish. UK. 2002.
2.A.L.. Macfie: Ibid, page 20
3.Alastair Bonnett: The idea of the West (culture, politics and history), London, 2004, page 4
4.Zachary Lockman: Contending Visions of the Middle East ( the history and politics of Oreintalism), University press new York. Page 14.

٥. نەریمان عەبدوڵڵا: (ڕۆژهەڵاتناسی، دەرکەوتن و ئامانجەکانی)، گۆڤاری کۆچ، ژمارە ٧و٨، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٢٨١.

٦. أزادە شاهمیری: (نضریة و نقد ثسا استعماری)، تهران، چاپ اول، چاپ ڕامین، سال ١٣٨٩. لاپەڕە ٥٢.

٧. د. مەحمود زەقوق: (لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆژهەڵاتناسیدا)، و. سەلام عەبدولکەریم، گۆڤاری کۆچ، ژمارە ٧ و٨، ٢٠٠٨ لا ٣٠٤.

٨. دکتر محمد دسوقی: (سیر تاریخی و ارزیابی شرق أندیشە شناسی)، ترجمە: دکتر محمود رضا افتخار زادە، تهران، چاپخانە، طلوع ازادی، چاپ أول، ١٣٧٦، لاپەڕە ٨٨.

٩. د. محەممەد دسوقی تێبینی ئەوە دەکات کە زاراوە لە لێکۆڵینەوەی ئەورووپییەکاندا هیچ جیاوازییەك ناکات لە نێوان ئایینەکان و ئەدەب و نەریتی ڕۆژهەڵاتدا، واتە هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئایینی ئیسلام و ئایینی (بودا) نییە، ئەمە هەڵەیەکی ئەنقەستی زانستییە و

وەك سوكايەتی بە ئایین و شارستانییەتی و فەرهەنگی ئیسلامە. بڕوانە:

د. محەممەد دسوقی: لا ٨٨.

10. Edward Said, Orientalism,(USA) penguin group, 200. Page 3.

11. Edward Said ; Ibid, page, 2.

12. Elena Andreeva , Russia and Iran in the great game(travelogoues and oreintalism), first publish U. S. A, 2007. P 23.

١٣. فاروق رەفیق: (غەمە جڤاتییەکان)، سلێمانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رەنج، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦. لاپەڕە ٢٨٨.

١٤. هادریان ڕیلاند: رۆژهەڵاتناسێکی هۆڵەندیە، مامۆستای زمانە رۆژهەڵاتییەکان بووە لە زانکۆی ئۆتریخت لە هۆڵەندا، لە ساڵی (١٧٠٥) کتێبێکی دەربارەی ئیسلام بە ناونیشانی (ئایینی محەممەدی) نووسیوە.. هاردیان لە کتێبەکەیدا هەوڵی داوە بۆچوونی رۆژهەڵاتناسەکان دەربارەی ئیسلام راستبکاتەوەو تێگەیشتنێکی زانستی هەبووە، ئەمەیش بووە هۆکارێك کە کەنیسەی کاسۆلیکی کتێبەکەی هادریانی خستە لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکانەوە، بەڵام ئەو رۆژهەڵاتناسە لە بۆچوونە زانستییەکانی پاشگەز نەبووەتەوە. بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: گۆڤاری کۆچ، ژمارە ٧ و ٨، لا ٣١٤.

١٥. هێنری لامنس (١٨٦٢–١٩٣٧): ڕۆژهەڵاتناسی بەلژیکی، ڕاهیبێکی دەمارگیر و دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بوو، لە شاری ژانتی بەلژیکا لەدایکبووە و لە تەمەنی گەنجێتی چووەتە زانکۆ لە بەیروت و وانەی مەسیحی خوێندووە و لە ساڵی (١٨٧٨) بووەتە ڕاهیب. دوو ساڵ لە گوندەکانی نزیك بەیروت بووەو پێنج ساڵ سەرقاڵی هونەر و فێربوونی زمان بووە، لە ساڵی (١٨٨٦) بووەتە مامۆستا لە زانکۆی بەیروت، دواتر ماوەیەك لە بەریتانیا ژیاوە و گەڕاوەتەوە بەیروت، پاشان بووەتە مامۆستای مێژوو و جیوگرافیا لە هەمان زانکۆ، لە دوای مردنی لویس شیخو، لە ساڵی (١٩٢٧) بووەتە سەرپەرشتیاری گۆڤاری ڕۆژهەڵات، کە کاری ئەم گۆڤارە موبەشیری و بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی بووە.

لامنس دەیان وتاری بە زمانی فەرەنسی دەربارەی موبەشیری مەسیحی و ئیسلام نووسیوە، کە هەندێك لە وتارەکانی وەرگێڕراون بۆ سەر زمانی عەرەبی، ئەو لە کارەکانی تەنها مەبەستی بووە سووکایەتی و ڕەتکردنەوەی ئاییني ئیسلام بێت، نەك کاری زانستی. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. محەممەد دسوقی: سەرچاوەی پێشوو لا ٣٤.

16. Zachary Lockman: Op. cit, page, 14.
17. Zachary Lockman: Ibid, page, 15.

١٨. فاروق ڕەفیق: سەرچاوەری پێشوو، لا ٢٥٢.

١٩. (سەلاحەددینی ئەیوبی گەورەتر لە رەخنەگرانی)، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین محەممەد حسێن، ئا، ئارام عەلی سەعید، هەولێر، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦. لا ٧٨.

20. Alastair Bonnett: Op. cit, page, 4.

٢١. د. محەممەد دسوقی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٨–٨٩.

22. Zachary Lockman: Op. cit, page13.
23. A.L.. Macfie : Op. cit, page, 15.
24. A.L.. Macfie; Ibid, page 15.

٢٥. تایری: شارێکی کۆنی باشووری وڵاتی لوبنانە، مێژووەکەی بۆ (٢٧٥٠ پ. ز) بۆ سەردەمی فینیقییەکان بە دواوە دەگەڕێتەوەو پێگەیەکی گرنگی بازرگانیی هەبووەو دوو بەندەری بۆ بازرگانی هەبووە بۆ گەیشتن بە ناوچەکانی دیکە.

26. Zachary Lockman: Op. cit, page, 11
27. A.L.. Macfie: Ibid, page 15
28. A.L.. Macfie: Ibid, page 16.
29. Zachary Lockman: Op. cit, page, 14
30. Zachary Lockman: Ibid, page15
31. Zachary Lockman: Ibid, page16.
32. Zachary Lockman: Ibid, page, 55
33. لەم بارەوە بڕوانە، A.L.. Macfie:, Zachary Lockman: سەرچاوەی پێشوو، IBN Kathir Ad-damishqi, Stories of the prophets, Maktaba Dar-u-lsalam, 2003. P 88
34. - IBN Kathir : Op. cit, page
35. , Zachary Lockman: Op. cit, page 55 .
36. A.L.. Macfie : Op. cit, page:19.

٣٧. گۆڤاری کۆچ، هەمان ژمارە، لاپەڕە ٢٨٢.

٣٨. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراسیی شارستانیی سەرمایەداری)، و: لوقمان عەبدوڵڵا، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەکانی کۆنگرەی گەلی کوردستان {ئاماژە بە شوێن و ساڵی چاپکردنی نەکراوە}، لا ١٨٤.

٣٩. ئافراسیاب گرامی: (ئاخێوی (گفتمان Discourse) زاراوە، رەوڕەوەی مێژوویی)، {هیچ ئاماژەیەك بۆ شوێنو ساڵی چاپکردنی نەکراوە}، لا ٢٦.

٤٠. ئیدوارد سەعید (ئیدوارد ودیع سەعید)، (١٩٣٥ـــ٢٠٠٣): بیرمەندی فەلەستینی ـ ئەمریکی، ئیدوارد لە فەلەستین لەدایك بووە و لە ئەمریکا ژیاوە تا مردنی، ماوەیەك لە میسر ژیاوە و لە خوێندنگەیەکی بەریتانی خوێندویەتی و دواتر چووەتە ئەمریکا بۆ مەبەستی خوێندن، تا پلەی خوێندنی دکتۆرای تەواو کردووەو بووەتە مامۆستای ئەدەبی ئینگلیزی لە زانکۆی کۆلۆمبیا.

سەعید، لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی (رۆژهەڵاتناسی) (١٩٧٨) بە چاپی گەیاندووە، رەخنەی توندی لە رۆژهەڵاتناسان گرتووە و پێیوایە، کارەکانیان خزمەت بە کۆلۆنیال دەکەن. نەك خزمەتکردن بە زانست، جگە لەو پەرتووکە چەندین پەرتووکی دیکەی دەربارەی بەراوردکردنی کەلتوورەکان نووسیوە. لەم بارەیەوە بڕوانە: د. مەریوان وریا قانیع: (کتێب و دونیا)، سلێمانی، چاپخانەی سەردەم، ٢٠١١، لا ٨٩ـ٩٣.

41. A.L.. Macfie: Op. cit, page 88

٤٢. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٩٨ـ٢٠٣.

٤٣. دەقـی نامەکـەی پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەر بێـت) بـەم شـێوەیە نووسـراوە: "لـە محەممـەد بەنـدە و پێغەمبـەری خـواوە بـۆ (هـەرقل) گـەورەی ڕۆمـەکان، سـڵاو لـەو کەسـەی شـوێنی هیدایـەت دەکەوێت، موسوڵمانبە سەلامەت دەبیت، موسوڵمان بە خـودای گـەورە دووچـەندانە پاداشـتت دەداتـەوە، ئەگـەر ملـت نـەدا، گونـاهی هـەموو نەریسییەکان لەگەردنتایە". بۆ زانیاریی زیـاتر بڕوانـە: صـفي الرحمـان المباركفوري: ژیننامەی پێغەمبەری ئیسلام (گوڵاوی سەرمۆر)، و. بـەکر حەمەصـدیق عـارف، چـاپی هەشـتەم، سـلێمانی، ناوەنـدی ڕۆشـنبیر، ٢٠١٣، لا ٢١٤.

٤٤. صفي الرحمان المباركفوري: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢١٣.

٤٥. یوحەننا دیمەشقی: قەشەیەکی مەسیحییە، لە سەدەی هەشـتی زاییـنی ژیـاوە، یەکێکـە لـە دژایەتیکـەرانی ئـایینی ئیـسلام، هەوڵیـداوە شـوێنکەوتووانی ئـایینی مەسـیحی بـە شـێوەیەك تێبگەیـەنێت ئیـسلام ئاینێکی ڕاست نییە.

46. Ziauddin Sardar: orientalism, first edition, Raj press, New Delhi, 2002. P 18.

47. Ziauddin Sardar: Ibid,page 18

٤٨. ئەڤارۆس (Alvarus) یان پۆل ئـەلبار، ئـەلڤارۆ دی کاردۆبـا، (٨٠٠ــ٨٦١ ز): توێـژەرێکی مەسـیحییە لـە باشـووری نیمـچەدوورگەی

ئـەلبیریا دەژیـا، وەك توێـژەر و تیۆریـان و شـاعیر دەرکـەوتووە، لـە سەردەمی موسوڵمانەکان ژیاوە، وەك کەسایەتییەکی ئـایینی مەسـیحی کاری کردووە و ئەوکاتەی ئەلبیریا کەوتە دەسـت موسـوڵمانەکان لـەوێ دەرنەچووەو ناڕازی بووە بە حوکمی موسوڵمانان.

49. Ziauddin Sardar: Op. cit, page,19.

٥٠. شەڕی خاچدروشمان: لـە سـەدەکانی (١١،١٢و١٣ ز) لـە نێـوان موسـوڵمانان و مەسـیحی ڕوویـدا، هـەموو مەسـیحییەکان لـەم شـەڕەدا بەشدارییان کرد، پارچەیەك خاچی سووریان هەڵگرتبوو، بۆیە بە شەڕی چاخدروشمان دروستە، نەك خاچپەرستان، بەو پێیەی خاچ دروشمیـان بووە، نەك پەرستراویان، ئەو شەڕە نزیکەی دوو سـەدەی خایانـدووە و هەشـت شـەڕ کـراون، کـە سـەڵاحەددینی ئـەیوبی تـوانی شـاری قـودس بگرێت، ئامانجی مەسیحییەکان لەم شەڕە ئـازادکردنی بەیتولمەقـەدیس کە زێدی لەدایکبوونی عیسا لـە دەسـتی موسـوڵمانان بـوو. بـۆ زانیـاری زیاتر بڕوانە: د. محەممەد دسوقی، لا ٧٠ـ٧٣.

51. Zachary Lockman: Op. cit, page39
52. - Zachary Lockman: Ibid. page, 41
53. - Zachary Lockman: Ibid. page, 46

٥٤. گۆڤاری کۆچ، ژمارەی پێشوو، لا ٣٠٦.

٥٥. هەمان سەرچاوە، لا ٢٨٢.

٥٦. هەمان سەرچاوە، لا ٣٩٣.

٥٧. دکـتر محمـد دسـوقی: (سـیر تـاریخی و ارزیـابی شـرق اندیـشه شناسی)، ترجمه: دکتر محمود رضا افتخار زاده، لا ٦١_٦٢,٨

٥٨. ازاده شاهمیری: نچریه و نقد پسا استعماری، لا ٥٤.

٥٩. دکتر محمد دسوقی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٤.

٦٠. گۆڤاری کۆچ، لا ٣١٧.

٦١. دکتر محمد دسوقی: لا ٩٥.

62. A.L.. Macfie: Op. cit, page25,26.
63. A.L.. Macfie: Ibid, page, 46.
64. A.L.. Macfie: Ibid, page37.
65. A.L.. Macfie: Ibid, page42.

٦٦. گۆڤاری کۆچ، هەمان ژمارەی پێشوو، لا ٣١٨.

٦٧. هەمان سەرچاوە، لا ٢٩٢.

٦٨. هەمان سەرچاوە، لا ٢٩٤.

# سەرەتا

باڵادەستیو رۆحیەتی مرۆڤی باڵا و گیانی خۆپەسەندی، لای رۆژئاواییەکان رەگ و ریشەیەکی مێژوویی هەیە و بۆ ناکۆکی چەند هەزار ساڵەی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا دەگەڕێتەوە.

ئەم ناکۆکییانەش لە شەڕی نێوان یۆنانی (گریك)ەکان و فارسەکان (ئێران)یەکان بەتەواوی دەردەکەوێت، بەوپێیەی ئێران وەك نوێنەر و سەرمەشقی رۆژهەڵات خۆی نواندووەو هەم لای رۆژئاوا، یاخود دروستتر بڵێین، لای یۆنانییەکان بینراوە، لەهەمانکاتدا یۆنانیش وەك نوێنەر و پێشەوای رۆژئاوا، لەم بوارەدا دەبینرا. لەبەر ئەوەی وڵاتی یۆنان خاوەنی شارستانیەتێکی بەهێز بوو، کاریگەری لەسەر وڵاتانی دیکەی ئەوروپا هەبوو، بەوپێیەی لەو کاتەدا ئەوروپا لە چەند هۆزێکی گەورەی ئەڵمانی پێکهاتبوون، هەروەها یۆنان، سەرچاوەی گەشەکردنی ئەوروپا بوو، لە هەمانکاتدا سروشتی پێشکەوتن و داهێنانەکانی سەدەکانی دواتری ئەوروپا بۆ یۆنان دەگەڕێتەوە.

هەروەها زۆربەی ئەندێشە و ئایدیا جیاوازەکانی ئەورووپا لە یۆنانەوە وەرگیراوە، لەهەمانکاتدا زۆرێك لەو چەمکانەی کە لە نووسین و قسە و ئاماژەکـان تائێـستاش بــەکاردەهێنرێن، سەرچــاوەکەی بــۆ یۆنــان دەگەڕێتەوە، وەك چەمکەکانی دیموکراسی، لیبراڵی، ئازادی و چـەندین چەمك و زاراوەی دیکە، لەگەڵ ئەوەشدا رۆحیـەتی بـاڵایی و هـەژموونی (ئـەورووپا و رۆژئـاوا) بـۆ یۆنـان دەگەڕێتـەوە، بۆیـە پێویـستە لـەوێوە دەستبکرێت بە قسەکردن لەسەر ئەو هەستی باڵایی و رۆحیەتە بەرزەی بەرانبەر ئەوانی دی وەك، رۆژهەڵاتی و ئەفریقییەکان هەیانە و میراتێکە تائێستا ماوەتەوە و کاری لەسەر دەکرێت.

لەمەوە قسەکردن لەسەر هەژموونی رۆژئاوا و ئـەمریکا بـەبێ یۆنـان، شـتێکی ئـەوتۆی نامێنێتــەوە و ناگەینــە دەرەنجـامێکی کـە جێگـەی رەزامەندی بێـت، بۆیـە بـە پێویـستی دەزانـین کورتەیـەك لـەو مێـژووە بخەینەڕوو، تاکو تێگەیشتنێکی زیاترمان بۆ ئەو مەبەستە هەبێت.

## هەستی باڵایی و گیانی خۆپەسەندی لای یۆنانییەکان بەرانبەر رۆژهەڵاتی و دەوروبەرەکانیان

(رۆحیەتی مرۆڤی باڵا، شارستانییەتی مەزن، وڵاتی یاسا و دیموکراسی، تاقانەی سەر زەمین، کەلتووری بەهادار) و چەندان چەمکی ستایشکارانەی دیکە وێنای یۆنانییەکانی پێش زایین بوو بۆ دەوڵەت ـ شارەکانیان، لەم رێگەیەوە و لەو جۆرە تێڕوانینەوە، مرۆڤەکانی دەرەوەی خۆیان بە (بەربەری، نەزان، ناشارستانی و دواکەوتوو) تەماشا دەکرد، بەتایبەتی مرۆڤی کیشوەرەکانی ئاسیاو ئەفریقا.

ئەو جۆرە تێڕوانینەی یۆنانییەکان بەدرێژایی مێژوو بە وردی تێبینی دەکرێت، لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینی، بەتەواوی رەنگیداوەتەوە و هەستی پێکراوە، ئەویش لە چەند رووداو و لەبەر چەند هۆکارێك، یەکێك لەوانە: سەرکەوتنی یۆنانییەکانە بەسەر فارسەکاندا کە ئەو کات سەردەمی (هەخامەنشین)ەکان بوو، وەك سەرکەوتنی رۆژئاوا و ئەورووپا بەسەر رۆژهەڵات و ئاسیادا تەماشا دەکرا.

لەوێوە هەژموونی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵاتدا لەشەڕی ماراسۆندا، لە نێوان فارسەکان (هەخامەنشیە)کان و یۆنانیەکان دەردەکەوێت، بەڵام پێش ئەو بەرواره و ئەو رووداوە، لای نووسەر و شاعیرانی ئەوکاتی یۆنان هەستی باڵایی لە نووسینەکانیان دەردەکەوێت، چەند بۆچوونێك لەسەر ئەوە کۆکن هەستی خۆبەگەورەزانیی و خۆپەسەندی یۆنانەکان بۆ نووسینەکانی (هۆمەر)[1] دەگەڕێتەوە، بەتایبەت لە داستانەکانی (ئیلیادە) و (ئۆدیسە)دا بەتەواوی دەردەکەوێت، کە تاکی یۆنانی بەبێ هاوتا و باشتر لە خەڵکی ئەو

سـەردەمە دادەنـا، هۆمـەر لـە ئیلیـادە و ئۆدیـسەدا بەتـەواوی ئەمـەی لـە سەدەکانی هەشتەم و نۆیەمی پێش زایین دەرخستووە.[٢]

لـەو سـەردەمە یۆنانیـەکان وا بیریـان دەکـردەوە کـە گـەورەی جیهـانن بەتایبەتی بەسەر فارسەکان، لایەنی نەژادپەرستی (ethnocentric)یان بەکاردەهێنا، ئەمـەش بـە واتـای ژێردەسـتی فارسـەکانو سـەروەری ڕێگـای ژیانی یۆنانییەکان بوو.[٣] بـەڵام وەك پێشتر باسکرا، شـەڕی ماراسـۆن، بـە سەرەتای بەریەککەوتن و هەژموونی ڕۆژئاوا دادەنرێت کە تێیدا یۆنانییـەکان سەرکەوتن، چونکە بەریەککەوتن و شەڕی نێوان کۆڕشـی گـەورە (٥٣٠ــ٦٠٠ پ. ز)، پاشای هەخامەنشینەکانی ئێران و دەوڵەتە ـ شارەکانی یۆنانـەکان، وەك سەرەتای ململانێ و بەریەککەوتنەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوا دادەنرێـت، چونکە ئەوکات کۆرشی مەزن، لە هـەوڵی فراوانکردنـی دەسـەڵاتەکەیدا بـوو، سەرەتا لەوڵاتی ئێرانەوە وەك لانکەی ئیمپراتۆرەکەی دەستیپێکرد، لـەوێوە دەستی بە فراوانبوون کرد بەرەو ناوچەکانی دیکەی جیهان، بـەجۆرێك تـاکو ئـەرمینیا و بـابلی کـۆن (سـوریا، فەلەسـتین و میـسۆپۆتامیا (عێـراق)) و ئـەنادۆڵی خـستە ژێـر دەسـەڵاتیەوە، سـەرەڕای ئـەوەی هۆشـداری دابـووە یۆنانو لەهەمانکاتدا میسری کۆن و باشووری ئەوروپای کۆنترۆڵکرد، لـەدوای زنجیرەیـەك شـەڕ لەگـەڵ یۆنـان، کـە چـەند دەیەیـەك درێـژەی کێـشا بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر یۆنـان، بـەڵام دواتـر لـە سـاڵی (٤٨٠ پ. ز)، لـە شـەڕی (ماراسـۆن)دا[٤] یۆنانییـەکان بەسـەر کۆرشـی گـەورەدا سـەرکەوتن، لـەوێوە هـەژموونیان دەسـتیپێکرد، وەك سـەروەر و ڕۆحیـەتی گـەورە لـە خۆیـان دەڕوانی[٥].

ئەو جۆرە تێڕوانینەیان، وا لە مێژوونووسانو لێکۆڵەرانی ئەورووپی دەکات، شەڕی ماراسۆن، وەك سەرکەوتنی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات دابنێن، وەك هەژموونی رۆژئاوایی باسی دەکەن، لەمەوە سەرزەنشتی رۆژهەڵاتیەکان دەکەن کە ئێران، (فارس)ەکان، نوێنەرایەتی دەکرد و یۆنان بەچاوی بەرز و پیرۆز و شکۆدار تەماشا دەکەن.

هەروەها لە ئەدەبیاتو سیاسەتیان ستایشی ئەسکەندەری مەکدۆنی، دەکەن و هەر هەمان هۆکار و خۆشەویستی زۆری ئەسکەندەر، وا لە رۆژهەڵاتناس (ئارنست رینان) دەکات مێژووی شارستانییەتی رۆژهەڵات بە ئەفسانە و مێژووی سیاسی رۆژهەڵاتیش بەبێ واتا و خراپ ناوببات. (٦)

بۆیە ئەسکەندەری مەکدۆنی لەژێر کاریگەری کەلتووری یۆنان (گریك) بەخێرایی گەشەی سەند و کۆتایی بە کەلتووری هەژموونگەری فارس هێنا، کە وەك نوێنەری رۆژهەڵات دەردەکەوت، بەمەش شارستانیەتە نوێیەکەی یۆنان *(بۆ ئەوکاتی بەریەککەوتنی نێوان یۆنانیەکان و فارسەکان نوێ بوو، بەوپێیەی فارسەکان خاوەن شارستانیەتێکی کۆنتر بوون)*، سەرکەوتوانە بەردەوام بوو کە یەکەم قۆناغی بەهێزبونی شارستانیەتی ئەوروپا و رۆژئاوایە. (٧)

لەوکاتەوە شانازییەکانی سەرکەوتنی یۆنان بەسەر کۆرشی گەورە بەردەوامی هەیە، تائێستا ململانێکانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا درێژەی هەیە و ئەو کەلتوورەی یۆنانییەکانی بە سەرکەوتوو، هەژموونگەر و گەورە نیشاندەدا و بە چاوی کەمتر سەیری فارسەکانی دەکرد، وەك ململانێی

نێوان سەرۆکەکانی هەردوو بلۆك، وەك ئەوەی هەمان کەلتوور لە نێـوان باراك ئۆبامـای سـەرۆکی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا و حەسـەن رۆحانی سەرۆك کۆماری ئێران هەیە، وەك چۆن بەردەوام ئۆباما بەسـەر رۆحانیدا بە سەرکەوتوو و گەورەتر و نموونەیەکی جوان دەبینرێت، ئاوا لای زۆرێك لە رۆژئاواییەکان، ئێرانیش نموونەیەکی ناشیرین و سیاسەتی ناسـەرکەوتوو دەبینرێـت. (*دیـارە رۆژئاواییـەکان مەبەسـتیان سیاسـەتەکانی ئێـران بەرانبـەر خـەڵکی کـوردو بـەلوچ و نەتـەوەکانی دیکەی نێو ئێران، وەك نەبوونی ئازادی و مافی تاکەکەس، نییە، بـەڵکو لەبەر ئەوە دژایەتی ئێران دەکەن کە ناچێتە ژێر رکێفی هەژموونیانەوە، نەك سیاسەتی ئێران بۆ خەڵکەکەی*).

لەوێوە بەراورد لـە نێـوان شکستەکانی کۆرشـی گـەورە لـە یۆنـان و سەرکەوتنەکانی ئەسکەندەر لە رۆژهەڵات دەکرێت، بە شێوەیەك، پاشـا فارسەکە نەیتوانی بگاتە ئامانجـەکانی بـۆ کـۆنترۆڵکردنی یۆنـان، بـەڵام ئەسکەندەر توانی وڵاتەکەی کۆرشی مەزن کۆنترۆڵ بکـات و باڵادەسـتی خۆی بەسەر رۆژهەڵاتدا بسەپێنێت.

تاکو ئێستاش، ئەو ململانێی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا، لە سیاسەتی نێوان ئێران و ئەمریکا بە ئاشکرا بـوونی هەیـە، ئەمـەش لەسـەر خـاکی وڵاتانی وەك: عێراق، سوریا، لوبنان، فەلەستین، یەمەن و بـەحرین هـەر سەرکەوتنێکی ئەو دوو نوێنەرەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، زیندووکردنەوەی هەژموونی سەردەمی یۆنانی کۆن و هەخامەنشینەکانی ئێرانە.

## ١. دەوڵەت ـ شار[٨] ی یۆنان وەك شانازی خۆپەسەندنی و هەژموونی رۆژئاوا

دەوڵەت ـ شار شێوە خۆبەڕێوەبردنێکی لامەرکەزی کۆن بوو کە بە رووداوێکی گەورەی سەدەکانی پێش زایینی دانراوە بەتایبەت لای یۆنانییەکان، لەگەڵ ئەوەی دروستبوونی دەوڵەت ـ شار و حوکمی دەوڵەت ـ شار بۆ رۆژهەڵات دەگەڕێتەوە، وەك دەوڵەت ـ شاری (ئور) (٣٨٠٠ پ. ز) لە سەردەمی سۆمەرییەکاندا، بەڵام یۆنان وەك شانازییەك بە دەوڵەت ـ شار و حوکمی دیموکراسییانەیان هەژموون و باڵایی خۆیان بەسەر رۆژهەڵاتدا دەسەپێنن، لەبەرئەوەی پێیانوایە، ئاسیا، فارسەکانی تێدایە لەلایەن کۆرشی گەورە و میسر (Egypt)یش لەلایەن (فیرعەونەکان)ەوە بەڕێوەدەبرێت. ئەم پاشایانە زۆر ستەمکار و بێبەزەییانە هەڵسوکەوت دەکەن *(مەبەست سەردەمی کۆنی میسر و ئێرانە)*، خەڵکەکەیان ژێردەست و مەزڵوم و کۆیلەن، بۆیە لە رۆژهەڵات و ئاسیا هێمنی و ئاسایشی تێدا بەرقەرار نییە و بەهای مرۆڤ لاوازە، لەهەمانکاتدا لە دەوڵەت ـ شاری یۆنان ئەو شتانە بە پێچەوانەوەیە، واتا لەوێ یاسا سەروەرە، دیموکراسی هەیە، خەڵك ناچەوسێنرێتەوە و جیاوازە لەگەڵ ئاسیا.[٩]

هەروەها ئەم جۆرە دارشتن و تێروانینەی یۆنانیەکان، لە سەردەمی ئیمپراتۆری رۆما بەردەوامی هەبوو، لە سەدەکانی پازدەیەم و شازدەیەمی زایینی کاریان لەسەر ئەم جۆرە تێڕوانینانە دەکرد، بەڵام وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، ئەگەر رۆژئاوایی‌و یۆنانییەکان پێیانوابێت

دەوڵەت ـ شار وەك داهێنانی یۆنانو هێمای شارستانیەتو گـەورەییان نیشان دەدرێت، لەهەمانکاتدا ئەزموونی لەم شـێوە لـە رۆژهەڵاتییـەکان چاوەڕوان ناکرێت، بەڵام دەوڵەت ـ شار، زۆر پێشتر لە یۆنانییـەکان لـە رۆژهەڵاندا بوونی هەبووە و دامەزراندنەکەی بۆ سەردەمی سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە.

بەوپێیەی دەوڵەت ـ شار کۆنترین سیستمی بـەڕێوەبردنیان بـووە و مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە، هەروەك دواتر لە ئیمپراتۆر و دەسەڵاتە شاهانەییەکان بوونیان هەبووە، دەکرێت بە ئەزموونێکی گونجاو بۆ ئەو سەردەمانە دانرێت.

## ٢. رۆڵی هەندێك لە فەیلەسووف و بیرمەندان لە پەرەپێدانی رۆحییەتی باڵای رۆژئاوا

لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمی پێش زایین، چەند فەیلەسـووفێك لە یۆنان دەرکەوتن، کە لەو سەردەم و چـاخانەدا رۆڵێکـی سـەرەکییان دەبینـی لـە پەرەپێـدانی هـەژموونی رۆژئـاوا، نووسـینەکانیان بوونەتـە داڕێـژەری بـیر و بۆچـوونە جیاوازەکـانی رۆژئـاوا، لـەو سـەردەمەدا لـە دەوروبەری دەوڵەتەـ شارەکانی یۆنان، خەڵکی بیانی نزیکیانبوونـەوە، بەڵام یۆنانییەکان بە چاوێکی نزمتر تەماشایان دەکردن و بە (بەربەری) ناویان دەبردن.[١٠]

دیارە ئەوە بەشێکی بۆ تێڕوانینـی فەیلەسـووفی یۆنـانی (ئەرسـتۆ) دەگەڕێتەوە کە دواتر کاریگەری هەبوو لەسەر بـیر و بۆچـوونی خـەڵکی

ڕۆژئاوا، کە بەرانبەر ڕۆژهەڵات بەکاریاندەهێنا، ئەرستۆ (٣٢٢ــ٣٨٤ پ. ن)، پێیوابــوو یۆنــان جۆرێــك لــە ســەروەری تێدایــە، بەربەرییــەکان کەسانێکن ناتوانن بە یۆنـانی قسە بکـەن، ئـەو بەربەریانـە دەوڵـەتێکی گەورەیان پێکهێناوە کە کۆیلەن و ناتوانن بەشێوەی دیکە بن. [١١]

ئەو شێوە تێڕوانینەی کـە ئەرسـتۆ بـۆ کەسـانی ڕۆژهـەڵاتی هـەیبوو تائێـستاش بەردەوامـە، بـەجۆرێك ڕۆژئاواییـەکان تەماشـای ڕۆژهـەڵات دەکەن، کە دەبێت لە خوار ڕۆژئاواییەکانەوە بن، ئەو جۆرە بۆچـوون و تێڕوانینانـە لای تـاکی ئـەوروپی هەسـتی پێـدەکرێت، هـەموو شـتێکی ڕۆژهەڵاتی بەکەم دەزانن و دەیانەوێت بۆ ڕۆژهەڵاتییەکانی بسەلمێنن کە شارستانیەتو کەلتووریان نییە، خودی ڕۆژهەڵاتییەکان وا بیر بکەنـەوە کە دژی کەلتوور و بەهاکانی خۆیان بن، لەهەمانکاتدا ئەگەر بێنـە سـەر ئەم تێڕوانینە کە وادەبن و لەنێو کەلتووری ڕۆژئاوا دەتوێنەوە، هێـشتا بەچاوی کەم تەماشا دەکرێن.

ئەو تێڕوانینەی ئەرستۆ، لەسەر دەرخستنی جیاوازی نێوان یۆنان و دەوڵەتەکانی دیکە بەشێوەیەك بوو، خۆشەویستی وڵات لەسەروو هەموو خۆشەویستییەکان و ڕەوشـتەوە بـوو، هـەر لـەو هەسـتی خۆشویـستنی نیـشتمانە، زیـاد لـە سـنووری خـۆی دەردەخرێـت تـاکو ئـەو ڕاددەی، ئەرستۆ دەڵێت: "یۆنانییـەکان بـە چ شـێوەیەك ڕەفتـار لەگـەڵ ئاژەڵـدا دەکەن، دەبێت بەهەمان شێوە ڕەفتار لەگەڵ بێگانەدا بکەن." [١٢] بـەم جـۆرە هـزری خۆشویـستنی وڵات بـەناو یۆنانیـەکان و وڵاتـانی دیکـەی ئەوروپا گەشەی سەند.

یۆنانییەکان خاوەنی کەلتوور، فەلسەفە و رۆشنبیرییەتێکی قوڵ بوونو پێویستە شانازیی پێوەبکەن، بەڵام ئەو شانازییکردنە لەسەر حسابی، بەچاوی کەمتر تەماشای کەلتوور، پیرۆزییەکانی گەلان و نەتەوەکانی دیکە، نەبێت.

ئەرستۆ لە خستنەرووی بۆچوونەکانی کاری لەسەر بەرزڕاگرتنی رۆحی باڵایی یۆنانییەکانو دواتر ئەورووپا دەکرد، چونکە ئەو نەخشەیەکی جیوگرافیای جیاوازی بۆ جیهان هەبوو بۆ جیاکردنەوەی کیشوەرەکان، یۆنانی وەك کیشوەرێکی سەربەخۆ و جیاواز دەبینی و خەڵکی یۆنانی بە مرۆڤی کامڵ و پێگەیشتوو ناودەبرد، هەروەها ئەرستۆ پێیوابوو ئەورووپاییەکان، خەڵکانێکی هەستەوەر و رۆحانیین، بەڵام لایەنی زرنگی، زیرەکی و دەستڕەنگینیان دەوێت و پێویستە هاوکاری بکرێن، هەرچی مرۆڤی ئاسیاییە (رۆژهەڵات)ی، بەپێچەوانەی ئەورووپییەکانەوە بەتوانا و زیرەکن، بەڵام لایەنی رۆحی و هەستەوەریان لاوازە و دەبێت لەو بەشەدا هاوکاری بکرێن، بەڵام لە نێوان ئەم دوو کیشوەرەدا خەڵکانێك دەژین لە نەژادی هێلینیەکانن یۆنانییەکان، کە هەردوو لایەنەکەیان تێدا بەدیدەکرێت، بەجۆرێك ئاستێکی باشی رۆشنبیری و زیرەکیان هەیە و لایەنی رۆحییشیان بەرز و باڵایە.[١٣]
بەڵام چەند سەدەیەکە ئەو بۆچوونەی ئەرستۆ، هەر لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە پێچەوانە کراوەتەوە، لەبەرئەوەی خەڵکی رۆژهەڵات بە بێ توانا و نەزان و نەخوێندەوار ناودەبەن، کە تەنیا خەریکی لایەنی

ڕۆحی و ئـایینین و لـه خـه‌می ژیانـدان، له‌هه‌مانكاتـدا ڕۆژئـاوا زیـره‌ك و سه‌روه‌ر و پێشه‌نگن.

*(ئـه‌م بۆچـوونه‌ی دواییـان تاڕاده‌یـه‌ك دروسـته‌، بـه‌و شـێوه‌ی كـه‌ ئـه‌وروپی و ڕۆژئاواییـه‌كان زیـاتر ده‌سـت و په‌نجـه‌یان له‌گـه‌ڵ زانـست نـه‌رمكردووه‌ و ڕۆژهه‌ڵاتییـه‌كانیش بـه‌پێی كـه‌لتوور و نـه‌ریتیان زیـاتر پابه‌ندی لایـه‌نی ئـایینی و ڕۆحـین، ئه‌مـه‌ش بـه‌و مانایـه‌ نـا كـه‌ زانـست به‌ره‌ـه‌م نـه‌هێنرابێت، چـونكه‌ چـه‌ندین نموونــه‌ی وه‌ك وڵاتـانی چـین، كۆریای باشوور، یابان، مالیزیـا، توركیـا و سـه‌نگاپور و چـه‌ندین وڵاتـی دیكـه‌ هه‌یـه‌ لـه‌ ڕووی زانـستی و ته‌كنـه‌لۆژیاوه‌ گه‌شـه‌یان سـه‌ندووه‌، له‌هه‌مانكاتـدا وڵاتـانی ڕۆژئـاوا و ئـه‌وروپاش لـه‌ ڕووی كۆمه‌ڵایه‌تییـه‌وه‌ هێنده‌ بێ ڕۆح و دژه‌ ئایین و كه‌مته‌رخه‌م نین كه‌ ڕۆژهه‌ڵاتییه‌كان باسی ده‌كه‌ن، چونكه‌ له‌ وڵاتانی وه‌ك به‌ریتانیا و ڕۆژهـه‌ڵاتی ئـه‌وروپا گرنگـی زۆر به‌ پلورانسی ئایینی و ڕێوڕه‌سمه‌ ئایینیه‌كان ده‌درێت).*

هه‌روه‌ها ئه‌و گه‌ڕیده‌ و سه‌ربازانه‌ی یۆنان كه‌ بۆ گه‌شـت، یـاخود بـه‌ مه‌به‌ستی ئه‌ركی سه‌ربازی هاتوونه‌ته‌ ئاسیا و ڕۆژهه‌ڵات به‌شێكی زۆر له‌ بۆچوونی بیرمه‌نـد و فه‌یله‌سـووفانیان هـه‌ڵگرتووه‌، واتـا كاریـان له‌سـه‌ر خۆپیرۆزكردن و به‌كه‌م ته‌ماشاكردنی ئه‌وانی دیكه‌ كردووه‌.

گه‌ر ئاماژه‌یه‌ك به‌ گه‌شـته‌كه‌ی زه‌ینۆفـۆن[١٤] بـدرێت، كـه‌ بـه‌ چـه‌ند ناوچه‌یه‌كی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاسـت و كوردسـتاندا تێده‌پـه‌ڕێت، چـه‌ندین نموونـه‌ی پایه‌بـه‌رزی و هـه‌ژموونی یۆنانییـه‌كان به‌سـه‌ر ڕۆژهه‌ڵاتـدا لـه‌ یاداشته‌كانیدا ده‌خاته‌ڕوو، كه‌ گه‌وره‌یی یۆنانییه‌كان ده‌سه‌پێنێت.

ئــەوەی زۆرێــك لــە رۆژئاواییــەكان لــە چــەند ســەدەی رابــردوودا بەئێستاشەوە شانازی پێوە دەكەن، هەمان ئایدیای یۆنانییەكانـە، كـە چۆن شـانازییان پێـوەكردووە، زەینـەفون كاتێـك لەگـەڵ (١٠) هـەزار سـەربازی یۆنـان دێنـە ئاسـیا، ماوەیـەك دەمێننـەوە و دواتـر لـەكاتی گەڕانەوەیان بۆ یۆنان تووشی چەندین گرفت دەبن.

زەینــەفۆن، لــە وتارێكیــدا بــۆ ســەربازەكان، وەك ئیرادەپێــدان و ملكەچنەكردن و خۆڕاگری، لە یاداشتەكانیدا **دەنووسێت:** "با لـەبیرتان بێــت، فــارس و برادەرەكانیــان بــەهێزێكی یــەكجار گــەورە هــاتن و وایانـدەزانی دەتـوانن ئەسـینا لەسـەر رووی زەمـین بسڕنەوە، بـەڵام ئەسینابییەكان ئازایەتیان هـەبوو كـە بـە تـەنیا بـەرەنگارییان بوونـەوەو بەزاندیانن... باوكانی ئێوە، باوكانی ئەو دوژمنانـەیان لەسـەر زەمـین و دەریادا بەزاند، بەڵگە ئەو جامەیە كە هەمانە، بەڵگەی گەورەتر ئازایەتی ئەو شارانەیە كە ئێمە تێیدا لەدایكبووینو پەروەردە كراین..." [١٥]

لـــەم نووســـینەی زەینەفونـــدا بەتـــەواوی ئـــەو رۆحیـــەتی خۆبەگــەورەترزانین و خۆپەســەندیە بەدیـدەكرێت، وەك پیرۆزكردنــی خاكی یۆنان و گەورەیی مرۆڤی یۆنان، بەسەر مرۆڤ و خاكی رۆژهەڵاتدا.

### ٣. نەژادی ئاریایی وەك رۆحی باڵای مرۆڤی رۆژئاوایی

نـەژادی ئـاری و رۆحـی بـاڵای ئاریـایی لایـەنێکی دیکەیـە کـە لای رۆژئاواییەکان هەیە و شـانازییکردن بـە نـەژادی ئـاری و خۆپەسـەندیو سەیرکردنی بە خودی باڵا بەشـێکە لـە پرۆسـەی دابـڕان لەگـەڵ ئـەوانی دیکە، ئەمـەش لەبـەردەم مرۆڤـی نـەژادەکانی دیکـەدا کـە بـە چـاوێکی کەمتر تێیاندەڕوانن، بەتایبەت نەژادی (سام)ی و (حام)ی.

لەگەڵ ئەوەی لێرەدا شوێنی ئەوە نییە کە بە وردی باس لە مێـژوو، جیوگرافیا و لایەنەکانی دیکەی نەژادی ئاری بکرێت، بـەڵام بەپێویـستی دەزانین ئەوە لەبەرچـاوی خوێنـەر روون بێـت، (نـەژادی ئـاری) کـێن و لەکوێوە ژیاون؟

ئاریەکان، بەو گەلانەی هندۆ ـ ئەورووپی دەوترێت کە لە بەشێکی زۆر لە ئەوروپا، ئاسیای ناوەڕاست، هندسـتان، ئێـران، کوردسـتان و چـەند شـوێنێکی دیکـە دەژیـن، لـەبارەی مێـژوو و شـوێنی سـەرەتایی ژیـانی ئاریەکانەوە بۆچوونێکی دروست نییە.

بۆچوونێك پێیوایە، سـەرەتای ژیـانی ئاریـەکان لـە بانـەکانی ئێرانـدا بوونو هەندێکیان بەرەو ئەوروپا کۆچیان کردووە، هەندێکی دیکەیان لە (١٥٠٠ پ. ز) بــەرەو هندســتان رۆشــتوون، ئــەوانی دیکــە لــە ئێــران ماونەتــەوە، کـە دواتـر بـە خـاکی فـارس، کوردسـتانو وڵاتـانی دیکـە بڵاوبوونەتەوە، بۆچوونێکی دیکە پێیوایە سەرەتای ژیانی ئاریـەکان بـۆ ئەوروپا دەگەڕێتەوە، هەندێکی دیکـە بـۆ ئۆراسـیا، کـە لـە پۆڵەنـدا بـۆ ئاسـیای ناوەڕاسـت ژیـاون، بۆچـوونێکی دیکـە رەسـەنی ئاریـەکان بـۆ

باشووری رووسیا دەگیرێتەوە کە لەوێوە هاتوونەتە ئێران و دواتر بەسەر چەند لقێك دابەشبوون[١٦].

ئەو بەراوردەی رۆژئاواییەکان لەسەر نەژاد دروستی دەکەن، تەنیا لەگەڵ ئەو نەژادانەی رۆژهەڵاتە کە ئاری نەژاد نین، چونکە ئەگەر بیانەوێت بەراورد لەگەڵ مرۆڤی رۆژهەڵاتی نەژادی ئاری بکەن، ئەوکات قسە لەسەر جیوگرافیای کیشوەرەکان دەکەن، یاخود قسە لەسەر ئایینەکان دەکەن، واتە بە هەموو جۆرێك خۆیان لە لێکچوونی نێوان مرۆڤی رۆژهەڵاتیو رۆژئاوای لادەدەن، لەهەمانکاتدا بەردەوام خەریکی رێککردن و داتاشینی مێژوویەکی جوانن بۆخۆیان کە هەوڵدەدرێت لێرەوە چەند نموونەیەك باسکرێت.

بەوپێیەی شارستانییەتەکانی رۆژهەڵات، کاریگەریان بەسەر شارستانیبەتی رۆژئاواوە هەبووە، دواتر چەندین بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە وەك نموونە باس دەکرێت، بەڵام بەشێك لەرۆژئاواییەکان، ئەوە دەشارنەوە و ناڕوونی و تەمومژێکیان دروستکرد، لەبەرئەوەی بە جۆرێك وەك بەکەمزانین دەیانبینی کە شارستانیەتی رۆژهەڵات کاریگەری لەسەر شارستانییەتی رۆژئاوا هەبووبێت، تەنانەت رۆژئاواییەکان شارستانیەتی یۆنان بەراورد بە وڵاتانی دیکە بە کەم دەزانن تا ئەوکاتەی کە خێڵە نەژاد ئارییەکان دەڕۆنە یۆنان و کاریگەری لەسەر ئەو شارستانیەتە دادەنێنو خۆیان واتەنی ئەوکات شارستانیەتی یۆنان دروستبوو کە لە باکوورەوە یۆنانیان داگیرکرد و تێکەڵ بە خەڵکەکەی پێش هێلینیك بوون کە هەم سپی پێست و هەم

قـەوقازی بـوون، بەمـەش خۆشـحاڵن، چـونکە نـە نـەژادی سـامی و نـە ئەفریقی بوون.[(١٧)]

دیارە ئەمەش وەك پێـشتر خرایـەڕوو بـۆ لێکجیاکردنـەوە و داڕنینـی کاریگەرییەکانی ڕۆژهەڵاتە بەسەر ئـەو شارسـتانیەتە و بـەئارياييکردنی شارستانیەتی یۆنانو هەم لێکجیاکردنەوەی گەل و نەتەوەکانی ئەفریقا، هەم نەژادی سامییەکان وەك دوو ڕەگەز و نەتەوەی جیاواز لەخۆیان.

هەروەها دابەشبوونی مرۆڤەکان بەپێی ڕەنگی پێست، بەپێی ڕەگەز و بـەپێی کـەلتوور جـۆرێکی دیکـە بـوو لەخۆجیاکردنـەوەکانی ڕۆژئـاوا، چونکە ئەوان مرۆڤی سپی پێستیان بە مرۆڤی باڵا و سەروەر دەناساند، تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت، مرۆڤی ڕەشپێستیان بە ئـاژەڵ و بەربـەری دەچوواند، هەمووان ئـەو سـیفەتانەیان هـەبوو، جگـە لـە مرۆڤـی سـپی پێست، ئەمەش دیارە ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیای ڕۆژئاوای دەبینی.

ئەو ڕەگەز پـەرەستییەی کە ئەوکات کاریان لەسەر دەکرد تائێستا لە ئەمریکا و هەندێك وڵاتی دیکە بوونی هەیە، بەڵام بەشـێوەیەکی دیکـە و سـەردەمێکی دیکـە وەك ئـەو نموونانـەی سـاڵی (٢٠١٥) لـە فیرگـسۆنی ئەمریکا، لە نێوان ڕەشپێست و سپیپێستەکان ڕوویدا کە کوشتنی چەند سپی پێستێکی لێکەوتەوە، هەروەها چەندین نموونەی دیکە هەیە کە لە نێوان ڕەشپێست و سپیپێـستەکان ڕوویـداوە، بـە جۆرێـك تـا ئێـستاش چەند مانگێك ئەو کێشەیە هەر بەردەوامی هەیە.

جــۆرێکی دیکــەی خۆپەســەندی ڕۆژئــاوا، وەك خۆپەســەندیان، ناسینەوەی مرۆڤەکان بـوو بـەپێی ڕەگـەز کـە ئـیتر مرۆڤـەکان بەتـەنیا

رەنـگ بڕیـار لەسـەر چارەنووسـیان نـادات، بـەڵکو رەگـەزیش خـاڵێکی دیکــەی یەکلاکەرەوەیــە، دیــارە ئەمــەش لەســەدەی نۆزدەیەمــەوە بەتــەواوی کــاری لەســەر دەکــرا، ئەمــەش لەرێگــەی ســود وەرگــرتن لەزانستەکان.[١٨]

دەبێـت لێـرەدا بـەکورتی دەرئـەنجامی ئـەو جیاکردنەوانـە تیـشکی بخرێتە سەر، دوای چەند سەدەیەك لە روودانیان دەرئەنجامی خراپیـان جێهێڵاوە کە بە هۆی نەژاد و رەنگی پێستەوە تەشەنەیان سەند، بوونە هۆی ئەوەی دەیان کوشتارگەی مرۆڤـی سـاز بکرێـتو هـەزاران خـەڵکی بێگوناهـ ببنـە قوربـانیی کـە تائێـستاش شـوێنەوارەکانی لـە ئـەمریکا و ئەوروپا و ئاسیا ماوە، ئەو دەمارگیرییەش جگە لە تێکشکاندنی مرۆڤـی (رەشپێست) و (سەر رەش) کە وەك کۆیلە و بەندە سەیر دەکران، بووە هۆی ئەوەی بە چاوێك سەیریان بکرێت، وەك ئەوەی بۆ خزمەتی مرۆڤی سپی پێست دروستکرابن.

هـۆی جیاکـاری نـەژادی و رەگـەزیش لـە سیـستمە فاشـیزمەکانی سەدەی بیستەم کە گەیشتبووە لوتکە لەلایەن فاشیزمەکانی ئیتالیاوە، شــانازییکردن بــوو بــەمیراتی ئیمپراتــۆری رۆمــی و لای نازیــەکانی ئــەڵمانیاش، شــانازییکردن بــوو بــە رەگــەزی ئــاری کــە لــە دیــارترین دەرئەنجامــەکانی کوشــتارگەی (هۆلۆکۆســتی جولەکــە)ی لێکەوتــەوە لەلایەن هیتلەر و نازیەکانەوە.

هەروەك تیشکی خرایە سەر، ئەو نەتەوانەی کە ئاری نـەژاد بـوون و سپی پێستن وەك فارس و کورد (دەبوایە لێرەدا زیاتر باس لـە نـەژادی

ئـاری و کـورد بکرایـە، بـەڵام لەبەرئـەوەی لـەم نووسـینەدا بـاس لـە دەروازەیــەك بــۆ رۆژهەلاتناســی دەکرێــت، بــە گونجاومــان نــەزانی نووسینێکی زۆر فراوان بێت).

ئەوکات لەدوای فکرەی رۆژهەڵات و رۆژئـاوا کاریـان لەسـەر کـەلتوور دەکرد، بۆئەوەی جارێکی دیکە هاوبەشی لە نێوان ئاسیا و ئەورووپا، یان رۆژهــەڵاتو رۆژئــاوا نــەبێت، بۆیــە کــەلتوور کرایــە دوا چــەکی جیاکەرەوەیان، چونکە هـەروەك نووسـەری کـورد لـە بـواری فەلـسەفە فاروق رەفیق، لە کتێبی (غەمـە جڤاتیـەکان) دەڵێـت: "رەگەزپەرسـتی کـەلتووریی، پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگرێـت کـە کـەلتوور جەوهـەرێکی نەگۆڕە، لێرەدا کـەلتووری "ئـەوی دیکـە" *(مەبەسـت لـە ئـەوی دیکـە، ئەوێکی هەسـتی خـۆ بـاڵایی و خودپەسـەندی و خـۆ بەگـەورە و باشـتر زانینە لەوێکی نەزان و بچووك و ژێردەست، کە ئەمە زیاتر لای ئەورووپی و رۆژهەڵاتییەکان کاری لەسەر کراوە)* وەك جیاواز دەناسرێتەوە و دانی پێدا دەنرێت، بەڵام جیاوازییەك کە نێگەتیڤە، مەبەست لە بەرزکردنەوە و پیرۆزکردنی کەلتووری "ئێمە"یە. بڕوانە فاروق رەفیق: لاپەڕە ٢٤٤.

هەروەها فاروق رەفیق لـەم بـارەوە، دەڵێـت: "ئەمـەش هاوشـێوەی خاڵــەکانی ســەرەوەیە، بــەڵام هــەروەك رۆژئاواییــەکان کــاری لەســەر دەکەنو بەم شـێوە دەیخەنـەڕوو، کـەلتوور دەبێتـە خـاڵی یـەکتربڕینی ئێمەی رۆژئاوایی لەگەڵ ئەوانی رۆژهەڵاتی، ئێمە یەك کەلتوورمان هەیە، سەرمەشقی جیهانە، ئەوان کەلتوورێکی تێکشکاو پـڕ لـە توندوتیـژی و خراپەکار وێنا دەکرێت. لێرەوە مەبەست و ئامـانجی خۆیـان بەتـەواوی

دەردەخەن، ئەوە ئێمەی ڕۆژهەڵاتین بەدوایاندا دەچین، ئەوە ئێمەین حاشا لە هەموو شتێك دەكەین تەنیا لەپێناو ڕاگرتنی دڵی ئەوان و خۆبردنە پێشەوە و دان پێدانان كە بەگژ هەموو شتەكانی خۆمان دەچینەوە و وێنایەكی ناشیرینیان بۆ دەكێشین، كە ئەندازیارەكەی ئەوانی ڕۆژئاوای و ئەوروپین، كە بەدرێژایی ئەو دوو ژیارەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا كاری لەسەر دەكەن، بەڵام دوای ئەوەی ئێمە واز لە هەموو شتەكانی خۆمان دەهێنین و دەچینە سەر ڕێگای ئەوان، كەچی بەوە ڕازی نابن و جیای دەكەنەوە كە تۆ ڕۆژهەڵاتیت، لە ئێران بیت، یاخود یابان، لە چین بیت، یاخود سووریا و كوردستان، تۆ وێنایەكی نەگۆڕ و وەستاوت هەیە كە ڕۆژهەڵاتییەكی توندوتیژ و نەزان و دژی شارستانییەت".[١٩]

## ڕۆما و درێژەدان بە ئایدیا و هزر و ڕۆحیەتی باڵایی یۆنانییەكان

لەدوای هێزی هەژموونگەری یۆنان، ئیمپراتۆری (ڕۆما)ش دروست دەبێت، كە پێكەوە وەك دوو شارستانی هێلینی، لەوێشەوە، یەكەمین گواستنەوەی شارستانییەتی ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوا، بەجددیی دەستیپێكرد، دیارە لەمەشدا سەركەوتوو بوون، هەروەك چەند فەیلەسووفێكی وەك: سۆلۆن، تالیس‌و فیساگۆرس، لە كۆشك و شارە گەورەكانی میسر، بابل، فارس‌و چەندین شوێنی دیكەی ڕۆژهەڵات گەڕاون و توێژینەوەی وردیان لەبارەی شارستانییەت و كەلتووری ڕۆژهەڵاتەوە كردووە، لە یۆنان و ڕۆما سوودیان لێبینیون.[٢٠]

ئەگەر سەرنجێك بەخێرایی لەسەر ئیمپراتۆری رۆم بخرێتەڕوو، بەپێی ئەو گەڕان و سوودبینینانەی لە شارستانیەتەکانی رۆژهەڵات بینیویانـە، هەروەها ئیمپراتۆری رۆمـای رۆژهـەڵاتی لەلایـەن چـەند کیـشوەرێکەوە دروســتکراوە، بــەڵام رۆژهەڵاتناســەکان لــە هــەوڵی ئــەوەدا بــوون کاریگەرییەکانی کیشوەرەکانی دیکە لەسەر ئەو ئیمپراتۆرە بـشارنەوە، چۆن ریشەی دەگێڕنەوە بۆ رۆژئاوا، چونکە ئیمپراتـۆریی رۆمـا لـە هـەر سێ کیشوەری ئاسیا، ئەورووپا و ئەفریقا، پێکهاتوون، هەر لە ئەفسەر و سیاســەتمەدارێکەوە بــۆ نووســەر، ئاســنگەر و پیــشەوەرێکی دیکــە، هەموویان بەشداربوون لە پەرەپێدان و بونیاتنانی ئەو ئیمپراتۆرەدا.[٢١]

چونکە لەسەر خاکی هەر سێ کیشوەرەکە دامەزرا بوو، بەڵام ئەوان ئەم رەوتەی مێژوو دەشێوێنن و کاڵایەکی دیکە بە بەری ئیمپراتۆری رۆمـادا دەکەن، راستە ئیمپراتۆری رۆمای رۆژئاوایی، سەرەتا لە خاکی رۆژئـاوا دروســتبوو، بــەڵام لــە کیــشوەرەکانی دیکــە گەشــەی ســەند، کەچــی دەیانــەوێت تــەنیا وەك میراتێکــی رۆژئــاوا بینــرخێننو هیــچی دیکــە، لەبەرئــەوەی بــاش دەزانــن رۆمــای رۆژهــەڵات بەرهــەمی هــەر ســێ کیشوەرەکەیە و لەسەر دەستی هـەمووان گەشـەی کـرد، بەتایبـەت لـە رووی سیــستمی ئــایینی و پەرســتنەوە کــە بەشــێکی زۆری پەرســتنە رۆژهەڵاتییەکان، وەرگیراوە بۆ رۆما، هـەروەها لەلایـەنی شارسـتانیەوە زۆرینەی فکرە و ئایین و کەلتوورەکانی دیکە لە زەوییەکانی رۆژهـەڵاتی دەریـای ناوەڕاســت وەرگــیراوە، تــا کــار گەیــشتە ئــەوەی ئیمپراتــۆری (رۆمای رۆژهەڵات) لەسەدەی چواری زایینی دامەزرێندرا.[٢٢]

## ڕۆڵی ژینگە و هەڵکەوتەی جیوگرافیا لە هەژموونی ڕۆژئـاوا

بەشـێکی دیکـە لـەو هەسـتی بـاڵایی و خـۆ بـە سـۆپەرمان زانینـەی ئەورووپا و دواتریش ڕۆژئاوا، پەیوەندی بـە سروشـتی ئـەو کیـشوەرەوە هەیە، چونکە سروشتی ئـەورووپا و جیوگرافیاکـەی لـەرووی ڕووبـەرەوە تەسك و بچووکە، کە خاکی زۆر لەبار نییە بۆ بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ و بژێوی ژیان، بەراورد بە فراوانی خاکی ئاسیا و ئەفریقا، دەوڵەمەنـدییان لـەرووی فراوانـی و بـەپیتی خاکـەوە، جگـە لـەوەی لـە خـاکی ئـەورووپا ناتوانرێـت وەك خـاکی ئاسـیا بەرهــەمی جیـاوازی وەرزەکـانی سـاڵی هەبێتو زۆر سوودی لێنابینرێت.

ئەوەی کە دەمێنێتەوە زەویەکی کەمی بەرهەمهێنان بوو، ناچاربوون ڕێزی زۆری لێبگرن و بەردەوام لـە هـەوڵ و جوڵـەدابن بـۆ پڕکردنـەوەی ئەم لایەنەیان و کەمکردنەوەی شکۆی بەرانبەرەکانیان کە ڕۆژهـەڵاتین، لەگەڵ ئەوەشدا خاکی ئـەورووپا، بـەهۆی زۆری بـاران، ساردی کـەش و هەوا، خاکێکە سروشتێکی جوان و قەشەنگی هەیە، هەستی جیاوازبوون لای مرۆڤـــەکان دروســـت دەکـــات بـــەراورد بـــە خـــاکی بیابانـــاوی و وشکهەڵگەڕاوی کیشوەرەکانی دیکە.

لەهەمانکاتــدا کێـشەی مانــەوەی ئــەورووپا لــەو دۆخــەدا دژوارە، ناوچەکانی بچووکن، بۆیە ئەمە کاریگەری بـۆ سـەربەخۆیی شـارەکان و وڵاتان هەیە[٢٣] ، بەڵام ئەبێت ئـەو مافـە بـە ئـەورووپی و ڕۆژئاواییـەکان بدرێت، بەهۆی قەشەنگی و جوانی کیشوەرەکەیانەوە، چـونکە لـە هـەر شوێن و وڵات و شارێك سروشتی جوانیان هەبوو خۆیـان بـە گـەورەتر و

جیاواز لەوانی دیکە دەزانن، تەنیا ئەوەندە هەیە ئەوروپییەکان ئەم هەستەیان تا ئەو رادەیە هەیە، کە دەچێتە چوارچێوەی سوکایەتی کردن بە ئەوانی دیکە، جا ئەوانی دیکە لەچاوی ئەوروپاوە، رۆژهەڵاتی بێت، یان ئەوانی دیکەی ئەفریقی.

هەروەها بەپێی سروشتی مرۆڤ، بەدرێژایی مێژوو، هەوڵدراوە جیاوازی دروستبکرێت لە نێوان دوو بووندا، یان دوو جیهانی جیاواز، وەك: ئێمە و ئەوان، رۆژهەڵات و رۆژئاوا، باکوور و باشوور، شارستانی و بەربەرییەکان و چەندانی دیکە[٢٤]، دیارە ئەمەش لای رۆژهەڵاتی و لای ئەفریقی و گەلانی جیاواز هەیە، بەڵام بەو جۆرە نەبێت بخرێتە چوارچێوەی سووکایەتی بە بەرانبەر.

## هەژموونی رۆژئاوا، لە دیدی رۆژهەڵاتناسانەوە

لەگەڵ بەردەوامی گەڕان و گەشتی گەڕیدە، بیرمەند و فەیلەسووفانی رۆژئاوا و هاتنیان بۆ رۆژهەڵات، بۆچوونەکانیان خستووەتەڕوو بەئەرێنی بێت، یاخود بەشێوەی نەرێنی، دیارە ئەو تێڕوانینانەش لەژێر کاریگەری فەیلەسووف و بیرمەندانی یۆنانی کۆندا بووە، بۆیە زۆرجار هەوڵیانداوە وێنایەکی جیاواز نیشان بدەن، لەهەمانکاتدا وێنایەکی گەورە بۆ رۆژئاوا و شارستانییەتەکەی دروستبکەن.

ئەم جۆرە تێڕوانینە لەسەدەی چواردە بەدواوە بەتەواوی دەرکەوت، بەو هۆیەی لەو سەردەمە بەدواوە شارستانیەتی ئەوروپا بەتەواوی گەشەی کرد و شارستانییەتی رۆژهەڵات، بەتایبەتی

شارستانییەتی ئیسلامی بەرەو داتەپین‌و لەناوچوون دەچوو، ئیدی ئەوان بۆچوونیان زۆر خراپ و نێگەتیڤ بوو بەرانبەر رۆژهەلاّت و شارستانییەتەکانی، ئەمەش لە نێو خەلّکی رۆژئاوادا بلاّوەیان پێدەکرد و بەتەواوی رۆحیەتی بالاّیی رۆژئاوایان دەخستەڕوو.

دروستە، دەوترێت: "ئەوان لە هەموو سووچێکی ئەم رۆژهەلاّتە وێنەیەك بۆ خۆیان بەرهەمدەهێننەوە کە خۆیان دەیانەوێت و رۆژئاوا بە بالاّ نیشان دەدات".[٢٥]

وەك ئەوەی دەیخەنەڕوو، هەندێکی دیکە پێیانوایە "خۆرهەلاّتیەکان وێنەی عاتیفی، ساکار و بیّ یادەوەری مێژوون، وێنەی ئەو مرۆڤەی کە لە هەموو کەسێك دەبوورێت و توانای یەکالاّکردنەوەی رووداوەکانی نییە، وێنەی ئەو سەربازەی لەپشت کۆلّۆنیالّ و ئینگلیزەکانەوە دەڕوات‌و بەدەمیانەوە پێدەکەنێت، ئەگەر سووکایەتی پێبکەن‌و جنێوی پێبدەن بەلایەوە حیکمەتە".[٢٦]

رەنگە لێرەدا جۆرێك لە زیادەڕۆیی تێدابێت، بەلاّم ئەوە ئاشکرایە کە رۆژهەلاّتییەکان لەژێر کاریگەری سۆز و عاتیفەدان، ئەمەش بە ئاشکرا لە دوای کۆنترۆلّکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکییەکانەوە لە سالّی ٢٠٠٣ دەبینرا کە چۆن کوردەکان پێشوازییان لە ئەمریکییەکان دەکرد .

سەرەڕای ئەوەی کە لە چەند شوێنی جیاواز و بەشێوەی جیاواز سەرباز و خەلّکی مەدەنی کوردستانیان کوشت، هەروها پێشوازی گەرمی ئەمریکییەکان، بەشێکی پەیوەندی بەو کاردانەوانەوە هەبوو بەرانبەر بە رژێمی بەعس، لە هەمانکاتدا هەموو کوردستان بەو شێوە

جوانه له ئەمریکییەکانی نەدەڕوانی، دیاره ئەمەش بۆ بەشێك لەو وڵاتانەی کۆلۆنیالکراوه، دروسته.

لێرەدا بەکورتی بۆچوونی چەند ڕۆژهەڵاتناسێك بەرانبەر ڕۆژهەڵات دەخرێتەڕوو، تاکو بزانرێت تێڕوانینیان بەرانبەر بە لایەنە جیاوازەکانی ژیان چۆن بووه.

ڕۆژهەڵاتناس (ڕۆیارد کپلینگ) دەڵێت: "خۆرهەڵات خۆرهەڵاتە، و خۆرئاوا خۆرئاوایه، هەرگیز بەیەکتری ناگەن".[٢٧]

لەمە زیاتر کپلینگ دەڵێت: "خۆرئاواییەکان ژیرن و خۆشەویستی ئاشتین، ئازادیخوازن، لۆژیکین، زاڵ و بەتوانان بەسەر بەدەستهێنانی بەهای ڕاستەقینەدا، بەڵام خۆرهەڵاتیەکان هیچ شتێکیان لەو سیفەتانه نییه".[٢٨]

لەم بۆچوونانەی کپلینگەوە دەردەکەوێت کە چەندە لە ستایشی ڕۆژئاوادایه و تێڕوانینی بەرانبەر ڕۆژهەڵات چەندە نیگەتیڤه، بەبێئەوەی هیچ لێکدانەوەیەك بۆ مێژوو و ژیانی ڕۆژهەڵاتیەکان بکات، ئەمەیە سوکایەتی بە بەرانبەرەکانیان دەکەن و وەك ئەوێکی دیکەی گێل و نەزان و ژێردەست تەماشایان دەکەن.

هەروەها (ماکدۆناڵد)ی ڕۆژهەڵاتناس دەڵێت: "ئەو جیاوازییەی کە عەقڵی ڕۆژهەڵاتی لە ڕۆژئاوایی پێ جیادەکرێتەوه، نەك هەر تەنیا خێرایی باوەڕکردنی شتە نادیارەکانه، بەڵکو عەقڵی ڕۆژهەڵاتی ناتوانێت سیستمێك بۆ ئەو شتانەی سروشت دابنێ کە بە چاو دەیانبینێ".[٢٩]

لەم بۆچوونەدا ماکدۆناڵد، مەبەستی خۆخەریککردن و سەرقاڵبونی ڕۆژهەڵاتییەکانە بە لایەنە ڕۆحی و دونیای مەعنەوییەت، کە ئەمە لای زۆرێك لە ڕۆژئاواییەکان، شتێکی بێ بایەخە و لەگەڵ زانستی ڕووت و بەرجەستە نایەتەوە، بۆیە بە چاوێکی کەم تەماشایان دەکەن و دەیانەوێت ڕۆژهەڵات لەمە دابڕنن. لەگەڵ ئەوەی هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەت وڵاتە زۆرینە موسڵمانەکان لە لایەنی ڕۆحی و مەعنەویەتیش بێ ئاگابوون، بەڵام وڵاتانی ڕۆژهەڵات و باشووری ئاسیا پابەندی نەریت و ئایینی خۆیانن و بەرەوپێشچوونی گەورەیان بە خۆوە بینیوە، وەك پێشتریش باسکرا، لە نموونەکانی: هندستان، یابان، چین، مالیزیا، ئەندەنووسیا و چەند وڵاتێکی دیکە.

بەکورتیەکەی پێیوایە، ئەوەی کە هەیە و شارەزایانی ئەم بوارە باسی دەکەن هەبوونی جۆرێك لە خۆخەریککردن و تێکەڵبوون بە جیهانێکی خودی و جیاواز لەیەك، چونکە خەڵکی ڕۆژهەڵات، بەتایبەت شوێنکەوتووانی ئیسلام، بەلایەنی ئایینەوە زیاتر گرێدراون کە زۆربەی کاتەکانیان بە بۆنە ئایینیەکانەوە سەرقاڵن، لەهەمانکاتدا ڕۆژئاواییەکان، بە مەسەلەکانی زانستی کۆمەڵایەتی و زانستە زیندوەکانی ترەوە سەرقاڵن و بەعەقڵەوە دەیانبەستێتەوە.

هەروەك هەندێکی دیکە لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، دەڵێن: "دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ڕێنیسانس و دەرکەوتنی مۆدێرنیزم وەك شارستانیەتی ڕۆژئاوا، لەوکاتەدا بوو کە ڕۆژهەڵات و ژیارەکەی ماندوو و هیلاك و پڕووکاو دەرکەوت. [٣٠]

هەروەها فەیلەسووفی فەرەنسی (مۆنتیسکۆ) دەڵێت: "دەسەڵاتدار و پاشا ئیسلامییەکان بە خوێنساردیەوە خەڵك دەکوژن، لە میللەتی خۆیان دوورن، بەڵام لە ئایینی مەسیحییدا، پاشاکان نابنە هۆی مەرگی خەڵك، بەهۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ کۆمەڵگا، خاوەنی هەست و سۆزێکی مرۆڤانەن، لەئاکامیشدا مل بۆ ئەوە دەدەن کە بکەونە ژێر رکێفی یاساوە".[٣١]

ئەم بۆچوونەی (مۆنتیسکۆ)، لایەنگری ئایینی مەسیحی پێوە دیارە و زیادەڕۆی زۆری تێدایە، چونکە نە هەموو پاشا و دەسەڵاتدارانی ئیسلامی ئەوەندە توند بوون، نە پاشا و دەسەڵاتدار و میرەکانی رۆژئاوا، بەو شێوە بوون کە باسی دەکات، بەوپێیەی چەندین خەلیفە و سوڵتان و والی هەیە، نموونەی حکومڕانی دادپەروەی دروستبوون، کە دەبوایە لەمەدا بەشێوەی رێژەیی قسەی بکردایە و بۆچوونی دەربڕیایە، هەروەها مێژووی مەسیحییەتیش دەیان نموونەی گەورەی کوشتارگەی دژی مرۆڤایەتی تێدایە، ئەگەر بڕیار بێت قسە لەسەر ئەو لایەنە بکرێت، دیارترینیان کێشەکانی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانەکان و دەسەڵاتی کەنیسەیە بۆ شەرعیەتدان بە پاشا و میرە فەرمانڕەواکان.

یەکێکی دیکە لەو جیاوازییە دروستکراوانەی بەردەوام جێگەی مشتومڕە، پاراستنی ئایین و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و خۆبەستنەوە بە رابردووەوە لای خۆرهەڵاتییەکان و ئیسلامە، بەڵام لە ئەورووپا لە دوای رێنسانس و چاکسازی ئایینی ئەم لایەنانە بوونی نەما، بەردەوام کنەو

پشکنینی هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیان کراوەو داماڵینی پـیرۆزی لـە شتەکان، بەتایبەتی ئایین و بۆنە کۆمەڵایەتییەکان.

بۆیـە لێـرەوە رۆژئاواییـەکان باڵادەسـتبوون و ئـەوەی کـە جـوانی و مرۆڤدۆستی بوو دەیاندایە پاڵ رۆژئاوا، جارێکی دیکە خوێندنەوەیان بـۆ مێژو و شارستانیەت و سەرجەمی زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەکردەوە.

لێرەوە، رۆژهەڵاتناسی، ئۆرێنتالیزم (Orientalism) لە بەرانبەر رۆژئاواناسی ئۆکسیدێنت (Occidentism) بەکاردەهێنن.[٣٢]

ئەوەی فەیلەسووفانی یۆنانی ڕۆڵی هـەبوو لـە دەرخـستنی جیـاوازی نێـوان کیـشوەرەکانو هـەژمونی یۆنـان بەسـەر رۆژهـەڵات، لای رۆژهەڵاتناسـەکانیش درێـژەی پێدراو لـە سـەردان و گەشـتەکانیان بـۆ رۆژهـەڵاتو دواتـر لـە نووسـینەکانیان ئـەوەیان بـە خـەڵکی دەگەیانـد، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم کیشوەرانەدا هەیـە، بـەجۆرێك، خـەڵکی رۆژهەڵاتو ئەفریقایان لە پلەیەکی نـزم و خـوارەوەی مرۆڤـی رۆژئـاوا و ئەوروپا دانا.

هەروەها، گەلانی عەرەب کە نەژادی (سامی)ن لە نەژادی ئارییەکان جیادەکەنـەوە، کـە ئارییـەکان وەك مرۆڤـی بـاڵا ناودەبـەن، یـاخود رەشپێـست و سپیپێـست بەرانبـەر بـە رۆژهـەڵاتی و ئـەفریقا بەکاردەهێنرێت، چونکە هەوڵیان دەدا ئەوانی دیکـە لـەخوار خۆیانـەوە ببینرێنەوە، بەڵام ئەمانـە مەبەسـتیان فراوانکردنـی ئیمپراتۆرەکـەیان و پـشتیوانی خـەڵکی بـوو، لـە سـەردەمی کۆلۆنیـاڵیزم زیـاتر مەبەسـتیان

ئـــابووری و کـــۆنترۆڵکردنی ئـــەو ناوچـــانەی ڕۆژهـــەڵات بـــوو کـــە سوودمەندبوون بۆیان.

بـچووککردنەوەی ڕۆژهـــەڵات و هیجەتــدان بــە ڕۆژئاواییــەکان بــۆ کۆنترۆڵکردن و دەستگرتن بەسـەر ڕۆژهـەڵات، بەشـێکی پەیوەنـدی بـە نووسینی بیرمەند و زانا ڕۆژئاواییەکانیشەوە هەیە، وەك ئەو بۆچوونەی فەیلەســووفی ئــەڵمانی (کــارل مــارکس) دەڵێــت: "ئەوانــە نــاتوانن نوێنەرایەتی خۆیان بکەن، بەڵکو دەبێت نوێنەرایەتی بکرێن".[٣٣]

ســەرەڕای بـچووکردنەوەی ئاسـیایی‌و خۆرهەڵاتییـەکان، لـە دیـدی مارکسەوە کە لێرەدا وەك وتەی ئۆرێنتالیستێك دەردەکەوێت، وتەکـەی دەبێتە بەشێك لە جەوهەر و بیرکردنەوەی ئۆرێنتالیستیانە، کـە بریتیـە لەنوێنەرایـەتیکردن‌و بـەڕێوەبردنی ڕۆژهەڵاتییـەکان، بـەهۆی نـەزانین‌و شـــارەزانەبوونیان، چـــونکە بـــەهۆی بەربـــەرییبوونیان و نـــەبوونی شارستانییەت و دواکەوتنیانەوە، نـەك لەسـەر ئاسـتی سیاسـی، بـەڵکو لەسەر ئاستی فیکری و مەعریفییش ناتوانن خۆیـان بەڕێوەببـەن، بۆیـە پێویــستە نوێنەرایــەتی بکــرێن، لەگــەڵ ئەوەشــدا وتەکــەی مــارکس لێکدانەوەیەکی دیکەی بۆ دەکرێت، کە لەلایەن ئەوروپیەکانەوە کـاری بۆ دەکرێت، ئەویش کێشەی "ئەوی دیکە"یە.[٣٤] ئـەوێك کـە لـە چـاوی منێکی ڕۆژئاوای نەخوێندەوارو دوور لە زانست و ناعەقڵانی‌و... هتد .

هــەروەها ئـــەم جـــۆرە بیرکردنـــەوە و نووســـینانە شـــەرعیەت بـــە کۆلۆنیالیزم دەدات، ئەمانەن کە هێزەکانی ڕۆژئاوا، بەتایبـەت بـەریتانیا دەکەنە ڕێبەر بۆ داگیرکردنی ئاسـیا و ئـەفریقا، وەك لـە ڕووی ئەگـەری

هەر پرسیارێك بۆ داگیرکردنەکەیان بیانوویان لەدەستدایە کە گوایە ئەوان ناتوانن خۆیان بەڕێوەبەرن، دەبێت ئەوروپییەکان بێن بەڕێوەیانبەرن، چونکە ئەوروپییەکان خاوەن شارستانیەت، بەڕێوەبەرایەتی، فەلسەفە و تیۆرەی سیاسیین، ئاسیاییەکانیش بە کاری ئایینی و ئەخلاقەوە سەرقاڵن و ئەو توانایەیان نییە.

ئەوەی پێویستە بخرێتەڕوو، مارکس ئەو زانیاری و بۆچوونانەی دەربارەی رۆژهەڵات دەیانخاتەڕوو، سەرچاوەکەی لە نووسینی ئەو گەڕیدە و رۆژهەڵاتناس و باڵیۆزانەی بەریتانیاوە دەستخستووە کە لە وڵاتی هیندستان و شوێنەکانی دیکەی رۆژهەڵات بوون، بێگومان ئەوانیش بەجۆرێك نووسیویانە کە بەرژەوەندی سیاسەتی خۆیان بێت و هەنجەتیان بەدەستەوە بێت بۆ داگیرکردنی هیندستان و وڵاتانی دیکە.

هەروەها بۆچوونی (مارکس) و (ئەنگلس)ی هاوڕێی زیاتر وەك بابەتێکی ئۆرێنتالیستیانە دەردەکەوێت لەمەڕ ئاسیا و ئەفریقاوە، بۆ نموونە ئەنگلس داگیرکردنی جەزائیر لەلایەن فەڕەنسییەکانەوە، وەك رووداوێکی گرنگ و شوێنی ئومێد لە رەوتی شارستانییەت، راپەڕینی (عەبدولقادر جەزائیری)ش، وەك جوڵانەوەیەکی بێئومێدانەی بەربەری تەماشا دەکات، لە ستایشی فەڕەنسییەکان دەبێت[٣٥] بۆ بەردەوامی و درێژەدان بە چوونە خاکی جەزائیر و وڵاتانی دیکە.

ئەم بۆچوونەی ئەنگڵس لەوێدا ناڕەوایە کە جەزائیرییەکان لە خاکی خۆیانن و بەرگری لە ناسنامەی خۆیان دەکەن، لە هەمانکاتدا فەڕەنسییەکان هێرش دەکەنە سەریان و خاکیان لێدەسێنن، بەڵام

دەبێت بەرگرییەکەی جەزائیرییەکان ناڕەوا و نائومێدانە بێت، لەهەمانکاتدا هێرشەکانی فەڕەنسا درێژەدان بێت بە ڕەوڕەوەی شارستانییەت و پێشکەوتن، لەمەوە ناڕەوایەتی و کاری نازانستی ڕۆژهەڵاتناسەکان دەردەکەوێت.

هەروەها لای (ئارنۆڵد تۆینبی)، خۆرئاوا پارێزەری کۆمەڵێك بەهای مەزنە، لەوانە: تاکگەرایی و دیموکراسی، خۆرهەڵاتیش سەرزەمینی ناسینەوەو شووناسی دەستەجەمعی و پێکەوەیی و عیرفان و ڕۆچوونە لەنێو ئاییندا.[٣٦] بەو جۆرەی کە تۆینبی باسی دەکات، خۆرئاوا داکۆکی لە خود دەکات، تاك سەربەست دەکات لە هەموو شتەکانیدا و تاك سەنتەرە، بەپێچەوانەی ڕۆژهەڵات کە هەموو شتێکیان بە دەستەجەمعیە، هەر لە مەراسیمی لەدایکبوون، ناشتن و نوێژی پێکەوەیی.. تا دوایی.

لێرەدا بۆ کۆتاییهێنان بە بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان، بەهۆی نەبوونی شوێنو کاتو سنووردارییی نووسینەکە، تەنیا ئەو بۆچوونەی پرۆفیسۆر (فرنر کلاوس روف) دەخرێتەڕوو، کە جوان درکی بەوە کردووە، لاساییکردنەوەیەکی ڕەگ داکوتاوی دوژمنایەتی لە خۆرئاوا بۆ ئیسلام هەیە و هەروەها دوژمنایەتییکردنی خۆرهەڵات بۆ خۆرئاوا ریشەیەکی مێژووی هەیە، ئەم ململانێ و پێکدادانە دەربڕینە لە دوو جۆر ژیان کە یەکتریان قبوڵ نییە و یەکتر ڕەتدەکەنەوە.[٣٧]

## رێنیسانس وەك هەژموونی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات

یەکێك لە دەرئەنجامەکانی رێنیسانسی ئەوروپا لە سەدەکانی چواردەیەم و پازدەیەمی زایینیو چاکسازی ئایینی لە ئەوروپا، دروستبوونی هەستی نەتەوەیی و خۆشویستنی وڵات و کیشوەر بوو.

ئەمە هێڵێکی دیار و بەرچاوی لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا و کیشوەرەکانی دیکە دروستکرد و نەژادی ئاری، لە نەژادەکانی دیکە پیرۆزتر و گەورەتر دانا، ئەمە وایکرد کەلتوور و ژیار و رۆشنبیرییەتی خۆیان لە خەڵکی بەباڵاتر تەماشاکەن، خۆیان بەسەر گەلانی تر بسەپێنن، ئەوان وەك سەردەستە و خەڵکانی دیکەش وەك ژێردەسەڵات سەیربکرێن.(٣٨)

سەدەکانی (١٤ – ١٥) زایینی لە ئەوروپا لە سەردەمی رێنسانس پرۆسەی چاکسازی و گۆڕانکاری ئەنجامدراو سوودیان لەو دەسەڵاتە دۆگماو چەقبەستووەی جیهانی ئیسلام بینیوە، توانیان لە رێگەی چاکسازی ئایینیەوە بەسەر دۆگمایی مەسیحیو پیاوەکانی کڵێسا سەربکەون و رۆژئاوا لە بەرگی ئایینی داماڵن، وەك ئەوەی لە سەدەکانی ١٦، ١٧ و ١٨ زایینی، لەمیانەی ریفۆرمی ئایینی و شۆڕشی فەلسەفی و زانستییەوە رۆشنگەری فەراهمکرد.(٣٩)

ئەم سەرکەوتنەی رۆژئاوا، تەنیا لە رووی زانستی و قازانجی مادییەوە نەبوو، بەڵکو سەرکەوتن بوو بەسەر هەژموونگەری ئیسلامیو سەرهەڵدانی هەژموونگەری ئەوروپی و رۆژئاوا کە تاکو ئێستا بەردەوامە و درێژەی کێشاوە، بەڵام ئەمە بەو مانایەی نا کە رۆژئاواییەکان

پێیانوایـە، نـەك شارسـتانی ڕۆژئـاوا، تاكـە شارسـتانی جیهانـە، بـەڵكو گەشەسەندووترین شارستانی جیهانە لەم سەردەمەدا، نـەك بـە درێـژای مێژوو.

دەكرێت ئەوە بخرێتە ڕوو، ئیسلام، لە دوای سـەدەی دوازدە، تـەنیا قاوغی شارستانیەتی مایەوە، ئەگینا ئەوی دیكـەی ڕۆژئـاوا بـردی، وەك ئەوەی سودیان لێدەبینی و هەژموونی پێـنج هـەزار سـاڵەی ڕۆژهـەڵات، كەوتە دەست هەژموونی (٥٠٠) سـاڵەی ڕۆژئـاوا، (٥٠٠) سـاڵی رابـردوو، سـەدەی وەسـتان و بەرەودواوەچـوونی شارسـتانییەتی ئیـسلامە و گەشەسەندنی شارستانییەتی ڕۆژئاوایە.

## ڕۆژهەڵاتی بێ شارستانی و بێ كەلتوور لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسانەوە

لەم ناونیشانەیاندا قسە و باس نییە لەسەر ئەوەی كە ئەوە دووپـات بكرێتەوە گوایە ڕۆژهەڵات خاوەنی شارستانیەتی گەورە بـووەو ڕۆژئـاوا سـوودی لێبینیـون، ئەگـەر ئەمـەش ڕاسـت بێـت، ئێـستا بـەدەردی ژێردەستیی ڕۆژهەڵات و بەتایبـەت جیهـانی ئیـسلامی نـاخوات، چـونكە دەبێت كار بۆ داهاتوویان بكەن، نەك شانازی رابـردوو لەگـەڵ وێرانـەیی ئێـستا و بێپلانـی داهـاتوو، چـونكە ئەگـەر تـەنیا شـانازی بـە رابـردوو بكرێت، نموونەی یۆنانی كۆن هەیـە كـە سـەردەمانێك جێگـەی شـانازی ڕۆژئاوا و بگرە ڕۆژهەڵاتیش بوو، بەڵام ئێـستا بوونەتـە بەڵایـەك بەسـەر ڕۆژئاوا و ئەوروپاوە، بەڵام كێشەكە لەوەدایە كە ئەوان دێن و ڕۆژهەڵات

دەخەنە دەرەوەی مێژوو، وەك باسی دەکەن هیچ شارستانییەتێکیان نەبووەو نییە.

بەجۆرێك هەندێك لە کاری گەڕیدە و رۆژهەڵاتناسەکان، وەك چۆن لە خزمەتی سیاسەتی ئەوروپا و رۆژئاوادایە، بەهەمان شێوە کاریان پیرۆزکردن و بەباڵا هەڵدانی رۆژئاوایە، کە چەمکێکی سەدەی نۆزدەی ئەوروپا و یۆنان وەك پێشتر بووە، ئەوان پیرۆزییەکانی رۆژهەڵاتیان دارنیوە و بەرگێکی نویَ و جیاوازیان بە بەری رۆژئاوادا بڕیوە، دیارە فەیلەسووفەکانی سەردەمی رۆشنگەری و بگرە پێشتریش، هەم وەك ئایدیای رۆژهەڵاتناسییانە و هەم وەك بیرمەند و نووسەری بواری جیاواز درێژەپێدەری ئەو رەوتەی بەپیرۆزکردنی رۆژئاوا و نەفرەتاندنی رۆژهەڵاتن، هەڵبەت هەموو رۆژهەڵاتناسەکان ئەم تێڕوانین و بۆچوونانەیان نەبووە، جگە لەوەی بەشێوەی جیاواز لەسەر رۆژهەڵات نووسینی ئەرێنی و پۆزەتیڤیان هەبووەو هەیە، دیارە ئێستاش ئەو هەژموونەی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات، بەشێکی بەرهەمی بیر و ئایدیای ئەوانەیە کە وێنەی ئەفسانە و جیاوازیان بۆ خۆیان دروست دەکرد.

بە بۆچوونەی ساموێل هنتنگتۆن، شارستانیەتی رۆژئاوا، تەنیا جیهانی نیە، بەڵکو تاقانەیە، هەروەك دەڵێت: "مەزنێتی شارستانیەتی خۆرئاوا، تەنها لەوەدا نیە کە جیهانیە بەڵکو لەوەدایە کە تاقانەیە لەجیهاندا".[٤٠]

ئەمەش بەو مانایەی لە جیهاندا شارستانیەتێك نییە جگە لە شارستانیەتی رۆژئاوا، هەموو ئەو شارستانیەتانەی کە هەبوون بچووكو

ناوچەیی بوون، وەك شارستانییەتی رۆژئاوا جیهانی و کاریگەر نەبوون، یاخود هەر نەبوون، بۆیە ئەم شارستانییەتە لە مێژوودا تاقانەیە.

بەبۆچوونی هنتنگتۆن، شارستانیەتی رۆژئاوا، تاقانەیە و شتێکی دیکە نییە بەناوی شارستانیەت لە مێژوودا کە بە ناوی رۆژهەڵاتەوە، یان بەشێکی دیکەی جیهانەوە بێت، جگە لە شارستانییەتەکەی رۆژئاوا.

لەگەڵ ئەوەی حاشا لە گەورەیی و باڵادەستی شارستانیەتی رۆژئاوا ناکرێت، بەڵام لەرابردوودا شارستانیەتی گەورە هەبووە لە رۆژهەڵات و لەئێستاشدا شارستانیەتی گەورەی، وەك: یابان، چین، هندستان، تورکیا و چەندین شارستانییەتی کاریگەر ئامادەییان هەیە.

بۆچوونێك کە تارادەیەك شارستانیەتی رۆژهەڵات رەتناکاتەوە بۆچوونی فەیلەسووفی ئەڵمانی (هیگڵ)ە[٤١] لە کتێبەکەیدا بەناوی (فەلسەفەی مێژوو) باس لەو رەهایی (مطلق)یەی رۆژئاوا دەکات، جیاوازی هیگڵ لەگەڵ ئەوانیتر لەوەدایە، کە شارستانیەت و مێژووی رۆژهەڵات رەتناکاتەوە، لەهەمانکاتدا بە شتێکی کەم تەماشای ناکات، بەڵام گەورەکردنو پیرۆزییەکی تەواو بە مێژوو و شارستانیەتی رۆژئاوا دەدات.

دیارە ئەمەش بە ناڕاستەوخۆ بچووککردنەوەی مێژوو شارستانیەتی رۆژهەڵاتە، چونکە بۆ خستنەرووی ئەو رەهایەتیەی رۆژئاوا لە گەشتەکەی بە ناوی (رۆحی موتڵەق) دەستپێدەکات، هیگڵ لە رۆحی موتڵەق، لەگەشتێکی گەردوونیدا لەنامۆبوونەوە بۆ بەخۆگەیشتن، لە خۆرهەڵاتەوە گەشتەکەی دەستپێدەکات، لە خۆرئاوا و ئەورووپای

سـەردەمی هیگـڵ خۆیـدا بـەخۆی و بـەکامڵبوون دەگـات، ئـەورووپا ئامانجێکی موتڵەقی مێژووە، مەبەستی ئەو، گەشتی رۆحە، کە هیگڵ بە مۆدێلی کۆچی خێڵە ئارياييـەکان بـەرەو خۆرئـاوا بـەراوردی دەکـات... رۆحی موتڵەق، رۆحی جیهانە، هەروەها وێڕای ئەوەی ئەفریقا، لەمێژوو دەکاتە دەرەوە و میللەتە بچووکە بێ دەوڵەتەکان بە میللەتی بێ مێژوو لەقەڵـەم دەدا، سـەرنجی زۆر خێـراو سـەرپێی دەردەبـڕێ لەسـەر موسـڵمانەکان و بۆچـوونەکانی سـەبارەت بـە ئایینـەکان و جیهانبینییەکانی خۆرهەڵات پڕیەتی لە کورتبینین و سادەیی و یەکێکە لەو فەیلەسووفانەی کە لە مەرکەزیەتی ئەورووپاوە قسە دەکات". [٤١]

هەندێك لە بیرمەند و فەیلەسووفەکانی رۆژئـاوا بۆچـوونی جیاوازیـان بەرانبـەر رۆژهـەڵات هەیـە، بـەڵام زۆرێکیـان بـە چـاوی کـەم تەماشـای رۆژهەڵات دەکەن، لەوانـە، نووسـەری (ئـەمریکی ــ بـەریتانی) بێرنـارد لویس، بەشێوەیەکی دیکـە بـاس لـە لاوازی شارسـتانیەتی رۆژهـەڵات و باڵایی شارستانیەتی رۆژئاوا دەکات.

لویس قـسە لەسـەر (مۆدێرنـەی نـاوخۆیی) و (مۆدێرنـەی دەرەکـی) دەکات، مۆدێرنەی ناوخۆیی واتە: گەیشتن بە کاروانی شارستانی نـوێ، بـەڵام مۆدێرنـەی دەرەکـی، واتـە: کڕینـی چـەك و بـەکارهێنان و تەقەپێکردنی. وێنای یەکەمی بۆ رۆژئاوایە و دووەمیش بۆ رۆژهەڵات.

مۆدێرنەی ناوخۆیی بەبۆچوونی بێرنارد لویس، مانای ئـەزموونکردنی شۆڕشـێکی فیکـری و وەرچـەرخانێکی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و دواجاریش سیاسی، هەروەها پێی وایـە خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت لـەدوای

زۆرێـك لـەو ناوچـانەوەیەكە تـازە پێـی گەیـشتوون، دەڵێـت: "ئەگـەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نەتوانن بە سەردەم رابگەن و خۆیان نوێبكەنەوە ئەوا ئەو كەلێن و جیاوازیە تادێت گەورەتر دەبێت.[٤٣]

بە بۆچوونی بێرنارد لویس، پێویستە ئەو وڵاتانە خۆیان بخەنـە ژێـر ركێفـی مۆدێرنـە، ئـەوەی مەبەسـتیەتی تەسـلیمبوونی رۆژهەڵاتـە بـەو هەقیقەتـەی كـە لای ئـەو بیرمەندانـەی دیكـە هەیـە بـە شارسـتانیەت و كەلتووری رۆژئاوا.

ئەگەر ئەمە لەلایەن رۆژهەڵاتییەكانەوە هەبێت و هـەموو كـەلتوور و شارستانیەت و بەهای خۆیان فڕێدەن و ئەوەی رۆژئاوا هەڵگرن‌و بیكەنە ناسنامەی خۆیان، ئەو كاتیش ڕازی نابن و بەدڵیان نییە، بەوپێیـەی لـە بنەمادا رۆژهەڵات لەلایان رەتكراوەتەوە.

بۆ گـۆڕینی ئێـستای خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت، وەك: بێرنـارد لـویس، دەیخاتەڕوو، سێ هۆكار هەن بۆ ئەوەی مـۆدێرن بـن ئـەوانیش توركیـا، ئیسرائیل و ژن، بە واتایەی توركیا خۆی لەو وڵاتانەی دیكە پاراسـتووە و ئیسرائیل جیـاواز و گۆشـەگیرە و ژنـان بێبـەش نەكـەن لـە كایـەكانی ژیان.

كـۆی نووسـینەكەی بێرنـارد لـویس لـەبارەی رۆژهەڵاتـەوە، بـەو نەفەسـەیە كـە خۆرهـەڵات دواكـەوتووە و مۆدێرنـەی دەرەكـی هەیـە، بەهەمان شێوە دووپاتكردنـەوەی گوتارەكـانی رۆژهەڵاتناسـیە و هیـچی دیكـە، كـە ئەیـەوێت بڵێـت مۆدێرنـە عـەقڵی جیهـان بـەڕێوە دەبـات و مۆدێرنە شەڕ بە كۆتا دێنێت و یاسا دادەنرێت لەكاتێكدا ئەمانە جگە لە

خەیاڵ، هەروەك پۆست مۆدێرنەكان باسی دەكەن هیچی دیكە نییە، چونكە دەكرێت ئەوە بخرێتە ڕوو كە مۆدیرنەی دەرەكی ئەوانەن كە چەك دەكڕن و تەقەی پێدەكەن، ئەدی كێ ئەم چەكانەی دروستكرد؟ بێگومان مۆدێرنەی ناوەكی، ئەو مۆدێرنەی كە زۆرێك لە خۆرئاواییەكان بانگەشەی عەقڵانیەتی بۆ دەكەن و ئەوانی دیكە ناعەقڵانی.(٤٤) ئەگەر بە بۆچوونێكی كورت كۆتایی بەو ناونیشانەی سەرەوە بهێنرێت، ئەوەیە: لەلایەنی مرۆڤایەتیەوە رۆژئاواییەكان بە بێتاوان دەرناچن، بەو پێیەی بەرهەمهێنەری چەكن لەبەر بەرژەوەندی ئابووری و دارایی دەیفرۆشنەوە.

## رۆژهەڵات لە نێوان بەربەرییبوون و خاوەن شارستانییبووندا

رۆژئاواییەكان، شتێكی ئەوتۆیان بۆ شارستانیەتەكانی رۆژهەڵات لە سەدەكانی كۆن، سەدەكانی ناوەراست و هاوچەرخدا نەهێڵاوەتەوە، هەندێك لە رۆژهەڵاتناسان و بیرمەند و فەیلەسووفان، وەك نەبوون، یاخود ماوەكورت و ناوچەییبوون باس لە شارستانیەتی رۆژهەڵات دەكەن، یان وەك ئەوەی هیگڵ باسی دەكات شارستانیەتەكانی رۆژهەڵات وەك سەرەتایەكی، شارستانیەتە گەورەكەی رۆژئاوابوونو دواتر نەماون، بەڵام شارستانیەتەكانی رۆژهەڵات لەسەردەمی خۆیان كاریگەرییەكی زۆریان لەسەر شارستانیەتی رۆژئاوا هەبووە، ئەمەش هەندێك لە فەیلەسووف و گەڕیدەكانی رۆژئاوا باسی دەكەن.

دیاره به تەنیا شانازیکردن و گەڕانەوە بۆ شارستانیەتی رۆژهەلات شتێکی ئەوتۆی لێ سەوز نابێت و هەندێکجار بێسود دەبێت، بۆیە ناکرێت ئێستایەکی هەژار و دەستکورتی شارستانی هەبێت و شارستانی رابردوو دەولەمەند بێت، بەجۆرێك تەنیا باس لەمێژوویەکی رۆشتوو بکرێت، لەهەمانکاتدا ئەوەش دروست نییە مێژووی شارستانیەتی رابردوو بشێوێنرێت.

دەبێت ئەوە روون بکرێتەوە کە رۆژئاواییەکان سوودیان لە شارستانیەتی رۆژهەلات بینیوە، وەك ئەو فەیلەسووف و بیرمەندانەی یۆنان باسی دەکەن. دواتریش رۆما، لە سەدەی شەشی پێش زایینیەوە هاتوونەتە شارە گەورەکانی رۆژهەلات و سوودیان لە شارستانیەتەکەی بینیوەو لەچەند سەدەیەکی زۆر پێشتریش دەستیان بە گواستنەوەی کەلتووری رۆژهەلات، کردووە.

بۆ ئەمەش گەڕانەوە پێویستە بۆ هەندێك لە بۆچوونەکانی بیرمەندی کورد (عەبدوللا ئۆج ئالان) وەك دەلێت: "گواستنەوەی کەلتووری ماددیی و مەعنەویی شارستانیەتی رۆژهەلات بۆ شارستانیەتی ئەوروپا کە شارستانی گریك ــ رۆما ئەنجامیدا بەر لە سالّی (١٦٠٠ پ. ز) لە میانەی میکان ـ هیلاس، بۆ نیمچەدوورگەی یۆنان، لە سالّی (١٠٠٠ پ. ز) لە ئەتروسکەکانەوە بۆ نیمچەدوورگەی ئیتالیا گواستراوەتەوە، هەرچی گواستنەوەی نیولیتیکە لە قۆناغەکانی (٧٠٠ــــ٤٠٠ پ. ز) بەردەوام بووە". [٤٥]

ئەو کاتەشی قەومی فینقی، لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی جێگیربوون، ئاواکردنی کۆلۆنی بازرگانی لە هەموو لایەکی دەریـای سـپی تایبـەت بـە فینقیەکانـە، ئـەوان یەکـەمین کـەلتووری ڕۆژهـەڵاتی نـاوین و میـسریان نزیکی ئەوروپا کردەوە، هەروەها دۆزینەوەی ئەلف و بێ، دروستکردنی کەشتی و چەندان هونەری دیکە، ئەوان خاوەنی بـوونو یۆنانییـەکانیان ئاشنای (ئەلف و بێ) کردووە، یەکەمین بەرهـەمیان دروسـتکرد و ڕۆڵـی بــەهێزیان هــەبوو لــە گواســتنەوەی کــەلتووری مەعنەویــشدا، ڕۆڵــی گرنگیشیان هـەبووە لـە مێـژووی شارسـتانییدا.[٤٦] هـەروەها جگـە لـەو کەلتوورەی لە شارستانییەتەکانی وەك بابل، میسر، ماددەکانو ...هتد لەلایەن یۆنانییەکانەوە وەرگیراوە، ڕاستی و هەقیقەتی ئەو ڕۆڵە گرنگـە لەلایەن فەیلەسووفی یۆنانی (ئەفلاتون) دەخرێتەڕوو.

لەگەڵ ئەوەشدا وەك پێشتر باسکرا، چـەند فەیلەسـووفێکی دیکـەی یۆنان، وەك: (سۆلۆن) (فیساگۆرس) و (تلـیس) چـەندین سـاڵ لـە بابـل ژیاون و گەڕاون و بۆچوونی فەلسەفەی خۆیان گەڵاڵە کردووە.[٤٧] بۆیـە ئەگەر کاریگەرێتی میزۆپۆتامیا و دەریای سپی نەبێت، شارستانییەتیش نابێت، یان دروستە بوترێت شارستانییەتێك بە تەنیا لە جیهاندا دروست نییە و کاریگەرییان لەسەر یـەکتر هەیـە.[٤٨] بـەڵام یەکـەم سەرسـامێتی ڕۆژئـاوا بــە ڕۆژهــەڵات، بــەدیاری کــراوی لەســەردەمی (ئەسـکەندەری مەکـدۆنی) دەردەکـەوێت، کاتێـك ناوچـەی ژێـر دەسـەڵاتی فارسـەکان (ئێـران)ی کـۆنترۆڵکرد، لەگــەڵ زۆرێــك لــە وڵاتــانی دیکـەی ئاسـیا، سەرسامیی خۆی بە کەلتوور و جۆری حکومدارێتی ئەوان دەربڕی و ئەو

سیستمەی ئەوانی دایە پاڵ دەسەڵاتی خۆی، بۆیە تێکهەڵکێشیەکی کرد لە نێوان شێوازی بەڕێوەبردنی هێلینیکی (یۆنان) و شـێوەی پاشـایەتی فارسی، بەمەش زیاتر دەسەڵاتەکەی گەشەپێدا تا مردنی ئەو شـێوەی جێبەجێکرد، بەڵام دوای خۆی دەسەڵاتەکەی گەڕێنرایـەوە سـەر شـێوە بـەڕێوەبردنی هێلێنیکـی، هـەروەها لـەژێر کاریگـەرێتی رۆژهـەڵات رۆمانییەکانیش سوودمەند بوون.[٤٩]

بەتایبەت لـە رووی سیـستمی ئـایینیو پەرسـتنەوە، بەشـێکی زۆری کەلتووری رۆژهەڵات وەرگیراوە بۆ ئیمپراتۆری رۆما، هـەروەها لەلایـەنی شارسـتانیەوە هەوڵـدراوە، زۆرینـەی فکـرە و ئایینـەکانی لایەنـەکانی دیکەش لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست وەرگیرێـت، تـا کـار گەیشتە ئەوەی لەسەدەی چواری زایینی ئیمپراتـۆی رۆمـای رۆژهـەڵاتی دامەزرێنن.[٥٠]

دیـارە دەبێـت لەبەرانبـەر ئـەو گواسـتنەوانەی بەشـێك لەکـەلتوور و شارسـتانیەتەکانی رۆژهـەڵات بـۆ یۆنـان و رۆمـا، شارسـتانیەتە رۆژهەڵاتییـەکانیش سـوودمەند بـووبن و کـەلتووری ئـەوانیان گواسـتبێتەوە، بـەڵام وەك ئـەو دوو شارسـتانیەتەی هێلینـی جـددیی و بەخێرایی نەبوو.

هەروەها لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامدا، بنەماڵەی عەباسـییەکان (٧٥٠ـ١٢٥٠ زایینی)، هەژموونگەریی رۆژهەڵات بـە لوتکـە گەیـشتووە و توانیویانە زۆر کاری داهێنەرانەی گەورە بکەن، بەجۆرێك بە ئەورووپایان بەخشیوەو هەم وەریانگرتووە، بەتایبەت لە نێـوان سـاڵانی (٨٠٠ـــ١٢٠٠

ن) شۆڕش و شێوە ڕێنیسانسێکی ئیسلامی جێگەی باس بوو، کرانەوەو وەرگـرتنو بەخـشینێکی زۆر لەلایـەن ئیـسلامەوە هـەبوو، بەتایبـەتی دەستیانگەیشت بە فەلسەفەی یۆنانو زۆرێـك لەبەرهەمـەکانی ئـەوانیان وەرگێڕا، هەروەها لە زانستەکانی پزیشکی، بایۆلۆجی، بیرکاری و چەند زانـستی دیکـە لـە پێـشی ئـەورووپاوە بـوون، لـە بوارەکـانی حیکمـەت، تەسەوف، مەنتق، ئیلاهیات و عەدالـەتی فەلـسەفی دا کرانـەوەی زۆری بەخۆیەوە بینیوە.[٥١]

ئەوەی کە بە *(سەردەمی زێڕینـی شارسـتانی ئیـسلام)* ناودەبرێـت، شتێکی ڕاستە و جێگـەی سـەرنج و تێڕامانـە، بـەڵام دواتـر ئـەم ڕەوتـە خرایـە ژێـر عەقڵیـەتێکی چەقبەسـتووری نـەگۆڕەوە و بواریـان بـۆ گەشەسـەندنی نـەدا و بـەرەو پووکانـەوە و داڕمـان چـوو، بەتایبـەت لەسەردەمی شەڕی بـەناو خاچـدروشمان (حـرب الـصليبيين) بەتـەواوی ئـەم ڕەوتـە پێـشکەوتنخوازە پەکیکـەوت و هـەموو شـتێك بـۆ ڕووبەڕووبونەوەی چەکداریی ڕۆژئاوا و مەسیحی، دانرا.

هەرچـی ئەوروپایـە، بـە پێـچەوانەوە، لەسەرچـاوەکانی شارسـتانی یۆنان و ڕۆما پەرەی سەندووەو هەوڵیاندەدا لـەو شارسـتانیەتانە باشـتر تێبگەن.

هەروەها سەرجەم ئەو سەرچاوانەی شارستانیەتی ئیسلام بۆ خۆیان گواستەوەو سوودیان لێبینیوەو توانیویانە چـەند هـەنگاوێك پێـی بچنە پێشەوە.[٥٢]

بەتایبەت ئەمە لەدوادوای سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئـەوروپا دەرگـای بۆ چەند لایەنیکی گرنگی کەلتووری رۆژهەلاّت خستە سەر گازی پشت و بەهۆیانـەوە یاسـاو نـەریتی کۆمـەلّگای دەرەبەگایـەتی هاتنـە لـەرزین، زۆربەی کەلتووری رۆژهەلاّتیش کە لەبنەڕەتدا ئیسلامی بوون، لـەڕێگای ئەنـدەلوس و سـەقلیە و ئـەو ولاّتـە عەرەبانـەی کـە بەسـەر رۆژهـەلاّتی دەریای ناوەراستدا دەیان ڕوانی، گەیشتە خاکی ئەوروپا.[٥٣]

ئەوەی کە ئەوروپا سـوودی لـە شارسـتانیەتی ئیـسلام بینـی، تـەنیا بەرهەمی جیهانی ئیسلامی و فەیلەسووف و رووناکبیری ئیسلامی نەبوو، بەلّکو بەرهەمی فەیلەسووفەکانی یۆنانو رۆژئاوا جارێکی دیکە لـەڕێگای ئەندەلوسەوە بەرهەمی فەیلەسووفە کۆنەکان و بەتایبـەت (ئـەفلاتون و ئەرستۆ) کە بە درێژایی چەند سەدەیەك وون بوبون لە رۆژئـاوا و دواتـر پەڕینەوە و گەیشتنە دەست ئەوروپییەکان، هەرچەند ئەو نووسـینانەی لــە خــەوش و ناتــەواوی بەدەرنــەبوون، بــەلاّم لــە روانگــەی ئــایین و تێڕواننینی شارستانیەتی ئیسلامییەوە شتی نوێیان خرابووە سەر و لـە رێگــای ســـەقلیەوە کـــە بەدرێـــژایی دوو ســـەدە لـــەژێر دەســـەلاّتی ئیسلامییەکاندا بوون، هەروەك پێشتر باسکرا، زۆر بابەتی زانیـاری وەك سروشتناسی و پزیشکی و فەلسەفی گەیشتنە ئەوروپا.[٥٤]

بەهۆی ئەو جۆرە تێڕوانینـە بەرانبـەر بـە کـەلتوور و شارسـتانیەتی رۆژهــەلاّت لەلایــەن رۆژهەلاّتناســانەوە دەردەبڕێــت و خراوەتــەڕوو،

بیرمەندی فەلەستینی (ئیدوارد سەعید)، ڕەخنەی توند لە بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان دەگرێت و پێیوایە ئەوەی لەڕۆژئاوا باسی لێدەکرێت، بەرهەمی خۆسەپاندن و خۆویستی و لەخۆباییبوونە و دەڵێت: "ڕۆژهەڵاتناسی بەرهەمی نەرجسیەت (خۆپەسەندی) و خۆویستیە، ئەمەش پاشماوەی کەلتوور و نەریتی ئەوروپییەکانە و لە نووسینەکانیان هەستی پێدەکرێت، کە تیایدا وێنای ڕۆژئاوایان کردووە وەك "خود"، خودێك کە لە بنەڕەتدا عەقلانی، گەشەسەندوو، مرۆڤدۆست، بەرز و بڵند، ڕاست و ڕەسەن، چالاك، دروستکەر و پیاوانە، وێنەی بەرانبەریش کە ڕۆژهەڵاتە، وێنەی "ئەویترە"، ئەوێکی ناعەقلانی و ناماقوڵ، لە ڕێگەلادەر و داماو، نەزان و دواکەوتوو، دیکتاتۆری ژێردەست، توندڕەو و توندوتیژ و پاسیف و گەندەڵ بە جەستەیەکی سێکسی...".[٥٥]

سەعید، جگە لەوەش، بەتوندی ڕەخنە لە ڕۆژهەڵاتناسان دەگرێت و پێیوایە، لەهەمانکاتدا بوونەتە ڕێگەخۆشکەر بۆ ئایدیای کۆلۆنیالیزم، چونکە پێشتر لەسەر ڕۆژهەڵات لێکۆڵینەوە نەکراوە و بەدوای زانستی ڕۆژهەڵاتیی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات نەگەڕاون، یاخود ئەگەر کۆڵنیاڵیزم نەبووایە، ئەوا ڕۆژهەڵاتناسی نەدەبوو.[٥٦]

هەروەها سەعید، پێیوایە ئیمپریالیزم تەنیا پڕۆژەیەکی داگیرکردنی سەربازیی خاکی ئاسیا و گەشەسەندنی سەرمایە نییە، بەڵکو

پڕۆژەیەکی باڵای داگیرکردنی بیری ئازادە کە ئـەوانی دیکـە وەك خـۆی بیربکاتەوە، لەمەوە دەسەڵاتی کۆلۆنیاڵەکان لە دەسەڵاتێکی سـەربازی و داگیرکارییـەوە دەچـێتە نێـو ئـەدەب و مێـژوو و لایەنـەکانی دیکـە، ئەمەش پەردە لەسەر ئەو بێلایەنیە دادەماڵێت کە بەردەوام دووپاتیـان دەکـردەوە، لەمـەوە ئـەدەب و هونـەر و مێـژوو و لایەنـەکانی دیکـەش وێنەی کۆلۆنیالیزم دەپۆشن و پرۆسەیەکی مەترسیدار دەسـتپێدەکاتو مەبەستی راستەقینەی خۆیان لەدەستدەدەن.[٥٧]

بـەڵام ئەمـە بـۆ هـەموو رۆژهەڵاتناسـان دروسـت نیـە، بـەڵکو ئـەوە ئیـدوارد سـەعیدە بـەو شـێوە لێیـان دەڕوانێـت، چـونکە هەنـدێك لـە رۆژهەڵاتناسان بە ئامانجی زانستی، یاخود ئاینی توێژینەوەیان لەسـەر رۆژهەڵات کردووە.

# ئەنجام

ڕۆحیـــەتی بـــاڵایی مرۆڤـــی ڕۆژئـــاوا، بەدرێـــژایی مێـــژووی هـــەردوو شارستانیەتەکە و بەیەکدادانیان هەبووە و بەردەوام دەبێت، ئەمەش لە ئـەنجامی هەنـدێك بۆچـوونی بیرمەنـد و فەیلەسـووفانی یۆنـانی و دواتـر ڕۆشنبیران و ڕۆژهەڵاتناسان دروست بووەو چووەتە نێو خەڵکیەوە.

بەردەوام ڕۆژئاواییەکان بەدوای هیجەتێکدا گـەڕاون تـاکو خۆیـان لـە ڕۆژهەڵاتی و ئەفریقییەکان جیابکەنەوە، ئەمەش بەڕوونی لای هەندێك لە فەیلەسـووف و ڕۆژهـەڵاتناس دەردەکـەوێت، لەهەمانکاتـدا ڕۆژهـەڵات و بەتایبەت وڵاتـانی جیهـانی ئیـسلامی بـە چـاوێکی کـەم و گومانـاوی بـۆ ڕۆژئاواییـەکانیان ڕوانیـوە و نەیانویـستوە تێکـەڵیان بـن و بـە شـێوەی جیاواز سـوکایەتییان پێکـردوون، وەك: کـافر، بێبـاوەڕ، ماددەپەرسـت ...تادوایی.

ئەو ململانێیەی لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەیـە، وەك جۆرێـك لـە ڕق وکینـە، بەرانبـەر یـەکتر بـەکاردەهێنرێت، لەمەشـدا پەیوەنـدی بـە لایەنی سیاسـییەوە هەیـە کـە بـەردەوام سیاسـییەکانی هـەردوو بلـۆك،

ناکۆکی دروست دەکەن و لە بەرژەوەندی سیاسی خۆیان گەورەی دەکەن.

هەندێك نووسەر و رۆشنبیری ئەوروپی شارستانییەتەکانی رۆژهەڵات، رەتدەکەنەوە، یاخود بە کەمی دەزانن، کەچی هەندێك لە شارستانیەتە کۆنەکانی رۆژهەڵات سەرچاوەی بەهێزکردنی شارستانییەتەکانی یۆنان و رۆما بوون، یان هیچ نەبێت سوودی زۆریان لێبینراوە.

ناکرێت رۆژهەڵاتییەکان و بەتایبەت جیهانی ئیسلامی، باڵایی شارستانیەتی رۆژئاوا، رەتبکەنەوە و جوانییەکانیان قبوڵ نەکەن، بە چاوی کەم تەماشا بکەن، هەروەها شانازی کردن بە مێژووی شارستانییەتەکانی رۆژهەڵات و تەنیا باسکردنیان بێت و بێ دەستەوەستان بن هیچ شتێکی لەم سەردەمەدا لێ بەرهەم نایەت.

پێویستە لەسەر رۆژهەڵاتیەکان بە باشی خوێندنەوەیان بۆ هەردوو شارستانیەتەکە هەبێت، بۆ ئەوەی هەستی خۆبەکەمزانین و ئەوی دیکە بەگەورەزانین نەبێت، وەك ئەوەی لەم سەردەمەدا لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە کاری لەسەر دەکرێت.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

١. هۆمەر (هۆمیرۆس): شاعیری گەورەی یۆنانی کۆنە، خاوەنی هەردوو داستانی شیعری (ئیلیادە) و (ئۆدیسە)یە و باس لە قارەمانێتی و سەربەرزیی گەلی یۆنان دەکات بەسەر گەلانیتردا، لەبارەی مێژووی ژیانی (هۆمەر)ەوە سەردەمێکی دیارییکراو نییە، هەندێك بۆ سەدەی حەوت و هەشتی پێش زایینی دەگێڕنەوە، بۆچوونێکی دیکە بۆ سەدەی دوازدە و سەردەمی شەڕی (تراجان)، بەڵام ئەوەی روونە ماوەیەکی زۆر پێش ئەسکەندەری مەکدۆنی ژیاوە، کەچی زۆربەی سەرچاوە تازەکان بۆ سەدەی حەوت و هەشتی پێش زایینی دەگێڕنەوە. هۆمەر، بە مامۆستای گەورەی یۆنان ناودەبرێت، لەبەر ئەو کارە گەورەیەی لە بەرهەمەکانی کردویەتی.

2. Rechard, L, Nisbett: The geography of thought (how Asian and westerner differently why ),New york 2003, page 3
3. Rechard, L, Nisbett: Ibid, page 4

٤. شەڕی ماراسۆن: شەڕی نێوان یۆنانییەکان و فارسە هەخامەنشین (ئێران)یەکانە، لە ساڵی (٤٨٠ پ. ز) بوو، سوپای هەخامەنشینەکان بە سەرۆکایەتی کۆرشی گەورەی پاشای ئێران بوو، لە ناوچەی ماراسۆنی یۆنان، دوای چەند دەیەیەك (چەندین ساڵ) لە شەڕ و ململانێ، ئێرانییەکان نەیانتوانی یۆنان کۆنترۆڵ بکەن و شکان، ئەم شکستەی ئێرانیەکان، یۆنانییەکانی ورەبەرز کرد و خۆیان بەسەرکەتوو بەسەر رۆژهەڵات دەزانی،

ئـەم هەسـتی خۆبەگەورەزانینـە تائێـستا بـەردەوامی هەیـە و لای رۆژئـاوا بەشێوەیەکی گشتی بەسەرکەوتن بەسەر رۆژهەلآت دادەنرێت.

5. Zachary Lockman: Contending Visions of the Middle East ( the history and politics of Oreintalism), University press new York. Page 12.

٦. دکتر محمد دسوقی: سیر تاریخی و ارزیابی شرق أندیـشه شناسـی، ترجمه دکتر محمود رضا افتخار زاده، تهـران، چـاپخانه، گلـوع ازادی، چـاپ أول، ١٣٧٦، لاپەڕە ١٩.

٧. عەبدوللآ ئۆج ئـالان: (قـەیرانی شارسـتانی لـە خۆرهـەلآتی نـاوین و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی)، وەرگێڕانی: لوقمان عەبـدوللآ، کتێبـی چوارەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە ٤٩.

٨. دەولـەت ـــ شــار: قەوارەیــەکی ســەربەخۆ، یــان ئۆتۆنۆمییــە و نەبەستراوە بە بەڕێوەبەرایەتی هیچ حکومەتێکی ناوەنـد، یـان ناوچـەییەوە، کە لە ناوچەیەکی جیاواز پێکدێت، یان بە شارێك بوترێت کە کۆمـەلێك گونـد لەدەوروبەری هەیە و خاوەنی یاسا و زمان و ئایینی خۆیانن، وەك قەرتاجـە، ئەسـینا، سـپارتا و چـەندانی دیکـە، یـان دەولـەت ـــ شـارەکانی سـەردەمی سۆمەرییەکان.

دەولەت ـ شـار، بەشـێوەیەکی گـشتی مـۆدێلی بەسەرچـووە، زۆرێـك لـە سەرچـاوەکان مێـژووی دەولـەت ـــ شـار بـۆ سـەردەمی یۆنـانی کـۆنو رۆمـا دەگێڕنـــەوە، بـــەلآم مێژووەکـــەی زۆر لـــەوە کـــۆنترە و بـــۆ ســـەردەمی سۆمەرییەکان دەگەڕێتەوە.

9. Zachary Lockman ; Op. cit، page 13.

١٠. ابو الحسن علي الحسني الندوي: (به داڕووخانی موسڵمانان، جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!)، و: ئارام گەلاڵی چاپی دووەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٢٣

١١. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٤.

١٢. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٣٩.

*13.* A.L.. Macfie: Orientalism, first bublish. UK, 2002, Page, 15.

١٤. زەینەفۆن (گەزنەفۆن): Xenophon: ئەفسەرێکی یۆنانی بوو، لە سەدەی چواری پێش زایین، لەگەڵ ١٠ هەزار سەربازی یۆنان لە ساڵی (٤٠١ پ. ز) دێنە رۆژهەلات (ئاسیا)، بەتایبەتی ئێران و ولاتانی دیکەی ناوچەکە بۆ یارمەتیدانی کۆرشی گەورە، دژی براگەورەکەی. زەینەفۆن، ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە و یاداشتەکانی تۆمار دەکات، دواتر هەر بە ناوی زەینەفۆن، بلاودەکرێتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، محەممەد جەلیزادە، (ولاتی بێ پایتەخت)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٦.

١٥. (گەشتەکەی زینۆفۆن)، وەرگێڕانی: محەممەد مەسعود محەممەد جەلیزادە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦ لاپەڕە ١٠٣.

*16.* S.R.Myneni: Indian history (f0r pre-law first year), Delhi, published by Allahabad Law agency, second edition, India , reprint 2008, page 28.

١٧. فاروق رەفیق: (غەمە جڤاتیەکان)، سلێمانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رەنج، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦. لاپەڕە ٢٦٧.

١٨. هەمان سەرچاوە: لاپەڕە ٢٤٣.

١٩. هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٢٠. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٠.

٢١. فاروق رەفیق سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە ٢٦٨.

*22.* Zachary Lockman; Op. cit، page 21

٢٣. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٣٨.

*24.* Samuel P. Huntington: the clash of civilizations and the remark of world order, penguin books, first edition, Delhi, India, 1997. Page 32.

٢٥. ئیسماعیل حەمەئەمین، (نەوەکان و گەڕەلاوژەکانیان)، (کۆمەڵەوتار) چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٢.

٢٦. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١١.

٢٧. سەلام عەبدولکەریم: (موقەددەس و کەلتوور (ئیشکالیەتی بەریەککەوتنی نێوان ئیسلام و خۆرئاوا))، چاپی یەکەم، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٧، لاپەڕە ٦٩.

٢٨. د. مەحمود زەقزوق: گۆڤاری کۆچ، وەرگێڕانی، سەلام عەبدولکەریم، ژمارە ٧و٨، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٣٠٣.

٢٩. ئافراسیاب گرامی: (ئاخێوی (گفتمان Discourse) زاراوە، رەوڕەوەی مێژوویی)، {هیچ ئاماژەیەك بۆ شوێن و ساڵی چاپکردنی نەکراوە}، لاپەڕە ١٦.

٣٠. هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٣١. مۆنتیسکۆ: (رۆحی یاساکان)، وەرگێڕانی: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی سێیەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە ٥٨٧.

٣٢. ئافراسیاب گرامی: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٩.

٣٣. فاروق رەفیق: سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە ٢٣٣

٣٤. فاروق رەفیق: هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٣٥. فاروق رەفیق: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٣٤.

٣٦. فاروق رەفیق: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٦٤.

٣٧. سەلام عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٧٥.

٣٨. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٨٥

٣٩. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٧

٤٠. سەلام عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٧١.

٤١. هیگڵ (١٧٧٠ـ١٨٣١): فەیلەسووفی ئایدیالی ئەڵمانیە، لە یەکێك لە بەرهەمەکانیدا بەناوی (ڕۆحی موتڵەق)، پێیوایە گەشتی ژیان لە ڕۆژهەڵاتەوە دەستپێدەکات، بەڵام لە ڕۆژئاوا کامل دەبێت و دەگاتە لوتکە، بەشێوەیەك شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەرزدەنرخێنێت.

٤٢. فاروق رەفیق: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥٩.

٤٣. بێرنارد لویس: (ڕابردوو و ئێستا)، وەرگێڕانی: شوان ئەحمەد، ڕۆژنامەی چاودێر، ژمارە ١٩٢، دووشەممە ٢٠١٤/٣/١٧. لاپەڕە ٥.

٤٤. بیرنارد لویس: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥.

٤٥. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٠

٤٦. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراسی شارستانی سەرمایەداری)، و. لوقمان عەبدوڵڵا، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەکانی کۆنگرەی گەلی کوردستان {ئاماژە بە شوێن و ساڵی چاپکردنی نەکراوە}، لاپەڕە ١٨١.

٤٧. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٨٤.

٤٨. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٨٨.

49. Zachary Lockman ; Op. cit، page 14

50. Zachary Lockman : Ibid, page, 15

٥١. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (قەیرانی شارستانی لە خۆرھەڵاتی ناوین و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی)، وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا، کتێبی چوارەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە ٥٦.

٥٢. د. کەمال مەزهەر: (رێنسانس)، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە: فوئادی مەجید میسری، چاپخانەی حەمدی، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە ٣١

٥٣. د. کەمال مەزهەر: هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٥٤. د. کەمال مەزهەر: هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

55. A.L.. Macfie: , Op. cit، page 8

56. A.L.Macfie, Ibid, page, 8

٥٧. ئیسماعیل حەمە ئەمین: سەرچاوەی پێشوو: لاپەڕە ١٥.

# سەرەتا

ڕۆژهـــەڵاتناس و گەڕیـــدە ڕۆژئاواییـــەکان، تێـــڕوانین و بۆچـــوونیان لەبارەی ئایینەکان و لایەنەکانی دیکەی ژیانی ڕۆژهەڵات خستووەتەڕوو، کـە دواتـر جێگـەی سـەرنجی ڕۆژئـاوایی و تەنانـەت ڕۆژهەڵاتییـەکانیش بووە. ئەوان وێنایەکی تایبەتیان بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتییەکان هەبووە و هەیـە، کـە تاڕاددەیـەك جیـاوازە لـە وێنـا ڕاسـتیەکەی، بـەڵام لـەم توێژینەوەیـەدا زیـاتر بـاس لـە تێـڕوانین و دیـدی ڕۆژهـەڵاتناس و فەیلەسووفانی ڕۆژئـاوا بـۆ ئـایینی ئیـسلام دەکرێـت و بۆچـوونی ئـەوان لەسەر ئەو ئایینە و هۆکار و ئامانجەکانیان لەوبارەوە دەخرێتەڕوو.

بەو پێیەی زۆرترین بەریەککەوتن لە نێوان جیهانی ئیسلام و ڕۆژئـاوا هەیە، پێویستە بۆچوونی ڕۆژئاواییەکان لەبارەی ئیـسلامەوە گەنگەشـە بکرێت، چونکە ئەو تێڕوانینانە لە هاتنی ئـایینی ئیـسلامەوە هـەتاوەکو ئەمڕۆ بەردەوامە و جێگـەی مـشتومڕە، لەبەرئـەوە بـە بـاش دەزانرێـت چەند نموونەیەك لەو بۆچوونانە باسبکرێت.

هەروەها سەرەتای کاری ڕۆژهەڵاتناسی بەشێوەی بەرنامەبۆدارێژراو و ڕێکخـــراو لەلایـــەن پیـــاوانی کەنیـــسەوە بـــوو، کـــە بـــە مەبەســـتی بەرەنگاربوونەوەی ئیسلام دەکرا، ئەوەیە کە تاکو ئێستا دانوییان پێکەوە

ناکولێت، دروستە ئەو مافە بە ڕۆژئاواییەکان بدرێت کە بەرگری لە ئایین و کـەلتوور و شوناسـیان بکـەن و مـافێکی سروشـتی خۆیانـە ئایینەکـەیان بپارێزن، بەڵام کار لەسەر ناشیرنکردنی ئایینی بەرانبەر نەکرێت.

ئەو بۆچوونانەی مەسیحیەکان، پەیوەندی بـە نزیکـی نێـوان ئیـسلام و مەسـیحی هەیـە. چـونکە زۆر بنـەمای سـەرەکی هاوبەشـیان هەیـە، ئـەو بنەمایانە پـێش هـاتنی ئیـسلام لەلایـەن مەسـیحییەکانەوە بانگەشـەی بـۆ دەکرا، بەڵام کە ئیسلام دێت و خۆی بە تەواوکـەری ئایینـە ئاسمانییـەکان دەزانێت، ئەوا لەلایەن مەسیحییەکانەوە قبوڵنەکراوە کە ئـایینێکی دیکـە، وەك ئەو، بگرە زیاتر، خۆی بە خاوەن ماف و هەق بزانێـت، لەهەمانکاتـدا پـەیامی ئاسمـانیی هـەبێت و وەك یـەك بانگەشـەی یەکتاپەرسـتی بکـەن‌و ئامانجیان لەیەکترەوە نزیك بێت، ئەمـە وای لـە ئـەوروپی و ڕۆژئاواییـەکان کرد، بە ئاسانی ئیسلام قبـوڵ نەکـەن، بەتایبـەت، پیـاوە ئایینیـەکانیان و دەسەڵاتی کەنیسەی ئەوکات، یاخود لای هەنـدێك لـە ڕۆژئاواییـەکان، وەك ئایینی ئاسمانی تەماشای ئیسلام نەکەن و ڕەتیبکەنەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە، موسوڵمانان داوای ئەوەیان لـە مەسـیحییەکان و شوێنکەوتووانی ئایینەکانی دیکە دەکرد کە بێنە سـەر ئایینەکـەی ئـەوان، تـاکو ڕزگـار بـن، ژیانیـان سـەلامەت بێـت، بـە پێـچەوانەوە هێـرش دەکـرا سەریان بۆ بە موسوڵمانکردنیان.

هەروەك پێشتر لە نامەکەی پیغەمبەری ئیسلام بۆ (هەرقل) گەورەی ڕۆمەکان، ئامـاژەی پێکـرا کـە پێیـدەڵێت "سـڵاو لـەو کەسـەی شـوێنی هیدایەت دەکەوێت، موسوڵمانبە سەلامەت دەبیت".

ئەوەی پەیامبەری ئیسلام کردی وەك گەیەنراوێکی ئیسلامی مافی خۆیەتی بیکات، بەڵام دەبێت ئەو مافە بە مەسیحییەکانیش بدرێت بەرگری لە خۆیان بکەن، بەشێوەیەك بێت ئایینەکەیان بپارێزن، کەچی هەندێك لەمەسیحیەکان پاراستنی ئایینەکەیان لەسەر حیسابی ئیسلام دەکرد.

سەرەڕای ئەوەی بەدرێژایی مێژوو بەریەککەوتن و کێشمەکێش لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هەبووە، بەڵام هەروەك هەندێك لە توێژەران ئاماژەی بۆ دەکەن، بە هاتنی ئیسلام، نەك ئەو ململانێ و یەکتر ڕەتکردنەوەی نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا کەم نەبوویەوەو ڕێگری لێنەکرا، بەڵکو پەیوەندییەکان خراپتر و ئاڵۆزتر بووە.

لەگەڵ ئەوەی چەند ئاماژەیەکی پێکەوەژیانیی لەم دوو ئایینە گەردوونیە هەیە، وەك نموونەی (نەجاشی) پادشای حەبەشە و پەیامبەری ئیسلام کە جێگەی باوەڕی یەکتربوونو لە بەرژەوەندی یەکدی کاریان کردووە، بەڵام لەهەمانکاتدایشدا چەندین نموونەی ململانێ و ڕووبەڕووبونەوە و یەکدی ڕەتکردنەوە هەیە، لەمەوە مێژوویەکی ناشیرینیان تۆمارکردووە، ئەمەش لەشەڕی بەناو خاچدروشمان، کە نزیکەی سێ سەدەی خایاند، دوای ئەوە شوێنی ژیانی پێکەوەیی و یەکدی قبوڵکردن، هەم لە نێوان ئەم دوو ئایینە ئاسمانیە و هەم لە نێوان کەلتوور و ژیاری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کەمبوویەوە.

جێـی خۆیـەتی بوترێـت، ئـەو یـەکتر رەتکردنـەوە و هێرشـکردنە سـەر یەکتریــەی لــە نێــوان ئــەو دوو ئایینــە هەیــە، تــەنیا شــەڕی چــەك و ڕووبەڕووبونەوە توندوتیژیەکان نییە، بەڵکو شەڕێکە هەندێکجار لـە بـواری پڕوپاگەنـدە بەرانبـەر یـەکتر لـە رێگـەی نووسـین و کـاری بـانگخوازی و مژدەبەخـشی (تبـشیري) و راگەیاندنـەوە لـە نێـوان هـەردوولادا هـەبووەو هەیە، وەك شەڕی دژی تیرۆر، لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە، یـاخود لەرێگـەی کاریکـاتێر و نووسـین و فـیلم و لایـەنی دیکـە، پـەیام و مەبەسـتی خۆیـان دەگەیەنن. لەکاردانەوەی ئەمانەدا هێرشکردنە سەر بارەگا و باڵیۆزخانـەی وڵاتـانی ئـەوروپا و سـوتاندنی ئـاڵا و بـایکۆت کردنـی کڕینـی جلوبـەرگ و نــەخواردنی خواردەمــەنی وڵاتــانی رۆژئــاوا لەلایــەن هەنــدێك لــەوڵاتانی ئیسلامیەوە، یان هەندێك لە شوێنکەوتووانی ئەو ئایینەوە ئەنجام دراوە.

لێـرەدا لەسـەر پـەیامی ئایینـەکان قـسە ناکرێـت، شـوێنی ئـەوەش نابێتەوە بەوردی باس لە ململانێکانی نێوان ئیسلام و مەسیحی بکرێـت، کە باسەکە زۆر پەیوەندی بەم لایەنەوە نییە، بەڵکو ئەوەی هەیە تـەنیا لە سنووری ئـەم دوو ئایینـەدا دروسـتکراوە و بـەناوی ئایینـەوە درێـژە دراوە بەکــەلتووری بەریەککەوتنــەکانی هــەردوو بلــۆکی رۆژهــەڵات و رۆژئـاوا، لـەوێوە سـوکایەتی بەئایینـەکانی یـەکتر دەکـەن، بـەڵام بـۆ دروستبوونی ئەم ململانـێ و بەریەککەوتنـە پێویـستە وردتـر تێـڕوانینی رۆژهـەڵاتناس و توێـژەرە رۆژئاواییـەکان بـۆ ئیـسلام و ئاماژەدانێـك بـە ئایینەکانی رۆژهەڵات بکرێت. دواتر تێڕوانینی رۆژئاواییەکان بۆ ئیـسلام بخرێتەڕوو، کە ریشەیەکی مێژووی و جیۆگرافی و سیاسی هەیە.

## وێنای ڕۆژهەڵات و ئایینەکانی لای ڕۆژهەڵاتناسان

ڕۆژهەڵاتناس و ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا، پێیانوایە بەشێك لە هۆکاری پێشکەوتنی ئەورووپا پەیوەندی بەو دید و تێڕوانینانەوە هەیە کە بۆ ئایین هەیانە، یاخود خۆیان تەسلیمی ڕێوڕەسم و بنەماکانی ئایین ناکەن، ئەم تێڕوانینە لەدوای ریفۆرمی ئایینی مەسیحی لەسەدەکانی ١٦ و ١٧ زایینی لە ئەورووپا دروست بوو، کە لە دژی دەسەڵاتی ئایینی مەسیحی وەستانەوە و نیگەرانیی سەریهەڵدا، ئەمە بەشێوەیەك بوو زۆرێك لە ڕۆشنبیر و بیریار و فەیلەسووفەکان باوەڕیان بە بنەما ئایینیەکانیش نەما، لە بەرانبەردا کارکردن بە بنەما زانستیەکان بونیاتنرا.

لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی بەرانبەر پێشکەوتنەکانی ئەورووپا هەیانە، گۆشەنیگایان بۆ ڕۆژهەڵاتیەکان بەشێوەیەکی دیکەیە، کە پێیان وایە خەڵکی ڕۆژهەڵات زۆر سەرقاڵی بۆنە ئایینیەکانن، زۆر کات بە پرسیارە ئایینیەکانەوە خەریکن، بەردەوام لەبارەی ڕۆژی دوایی و داهاتووی مرۆڤایەتی دەپرسن و دەیکەنە کێشەی گەورە، ڕۆڵی ئایین لە ڕزگارکردنی مرۆڤ و ڕۆحی و دەیان پرسیاری دیکە کە مێشکی ئاسیاییەکانی سەرقاڵکردووە، بەڵام ئەورووپیەکان کەمتر خەریکی ئەم پرسیارانەن، بەوپێیەی ژیانێکی ڕەفاهییان دەوێت، دەخوازن بزانن چۆن دەژین و چی تازە ڕوویان تێدەکات؟ شوێنی کارکردنیان کوێیەو مووچە و ماڵ و سەروەتیان چەندە؟ بەڵام لەو پرسیارە ئایینیانە نزیك نابنەوە، بۆیە ئەمە خاڵێکی ناکۆکی نێوان هەردوو لا دەبێت، ئەوان

(ڕۆژهەڵاتییەکان)، دەیانەوێت دابڕاو نەبن لە ئایین و لەگەڵیان گەشە بکات، کەچی ئەوروپییەکان نایانەوێت لەپرسیارە ئایینییەکان نزیك بنەوە، بەڵام ئەمە بۆ هەموو ڕۆژهەڵات و هەموو سەردەمێك و قۆناغێکی مێژوو دروست نییە، بەوپێیەی لەهەندێك لەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵات ئایین ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە ژیانی خەڵکی و پێوەرە ڕەوشتی و مرۆڤ دۆستیەکان، هەندێك لەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵات کە ئایین پێگە و قورسایی هەیە، پێشکەوتوون بە بەراورد بەهەندێك لەو وڵاتانەی کە ئایین لاوازە، یاخود کۆمۆنیستین، وەك: نموونەی مالیزیا و کوبا، سەنگاپوور و کۆریای باکوور، لەوێدا ڕاستە کاتێکی زۆر بەبۆنە و فیستیڤاڵ و جەژنە ئایینی و نەریتی و کەلتووریەکانەوە بەسەر دەبرێت، وەك ئەوەی لە وڵاتێکی وەك هندستان هەیە، بەڵام بەرە و دوا نەچوون، یان لە ڕەوتی پێشکەوتنی مێژوو نەوەستاون و هەنگاوی باشیان بەرەو پێش ناوە، هەروەها لە دەوڵەتە ئیسلامییەکانی وەك تورکیا و ئێران و ئەندەنووسیا گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژیی باشی بەخۆوە بینیوە، یان لەو دەوڵەتانەی بڕوای بودییان هەیە، وەك: ڤێتنام و تایلەند، لەهەمانکاتدا ڕۆژئاواییەکانیش هێندە دوای ڕەفاهیەت ناکەون کە لایەنی ڕۆحی و مەعنەوییان پەراوێز خستبێت!.

هەروەها لەنێو ئایینەکانی ڕۆژهەڵات، توێژەرە ڕۆژئاواییەکان، زیاتر تێڕوانینیان لەسەر ئیسلام چڕبووەتەوە، بەوپێیەی زۆرترین بەریەککەوتنیان دەبێت و ئیسلام و ئایینی ڕۆژئاواییەکان کە مەسیحییە، لەیەکترەوە نزیکن، چ لەلایەنی جیهانی دەرەوە و ڕەفتاری

زۆریان لەگەڵ یەکتر، هەم وەك پەیامیان. لەهەمانکاتدا ترسیان بۆ سەر یەکتر هەیە، چونکە هەردووکیان ئاینی کراوەن و کاری بانگخوازی و مژدەبەخشیان تێدا ئەنجام دەدرێت و بەئاسایی دەتوانن خەڵك بهێننە نێو ئایینەکانیان، بۆیە بەردەوام کار بۆ بچووککردنەوەی یەکتر دەکەن، ئەمەش لە هاتنی ئیسلامەوە بوونی هەیە، بۆیە دەبێت مێژووی واقیعیان دەربخرێت و بۆچوونی رۆژئاواییەکانیش بۆ ئایینی ئیسلام بخرێتەڕوو.

## هاتنی ئیسلام و بارودۆخی ئەوکاتی ئایینی مەسیحی (کریستیان)

لەکاتی هاتنی ئیسلام ساڵی (٦١٠ ز)، کە وەحی بۆ پەیامبەری ئیسلام هات، لەو ساڵەوە بە نهێنی دەستکرا بە بانگەواز و بانگکردنی خەڵکی بۆ هاتنە نێو ئیسلام، دوای (١٠) ساڵ لە راگەیاندنی بانگەوازەکەی لە مەککە و (١٣) ساڵ لە مەدینە، ئایینی ئیسلام کاریگەری لەسەر ناوچەکانی دەوروبەری دانا، پەیتاپەیتا بەرەو ناوچەکانی دەرەوە دەچوو، ئەمەش لەرێگەی فتوحاتەوە، لە کاتی هاتنی ئیسلام، جیهان لە بۆشاییەکی گەورەدابوو.

بەو پێیەی ئایینی ئیسلام، لە قۆناغ و سەردەم و جێگەیەکی دیارییکراودا دەرکەوتووەو بڵاوبووەتەوە، بەجۆرێك دیاردەیەك بووە لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و سروشتێکی ناچاری هەبووە، هەر دەبوو دەربکەوێتو بەو شێوەو ناوەڕۆکەی کە پێی دەرکەوتووە، چونکە ئەرکێکی دیارییکراوی لە ئەستۆدا بووە بۆ جێبەجێکردن[1]

ئایینە زەمینییەکان، کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر ژیانی خەڵکی نەمابوو، لەهەمانکاتدا ئایینە ئاسمانییەکانیش هێزی رۆحی و پەروەردەیان لاواز بوو بوو، روونتر بووترێت لەوە دەرچوو بوون ئایینی خەڵکی بن، بەڵکو لە شێوەی ئایینی دەسەڵاتدار و پیاوە گەورەکاندابوو. وەك پشتیوانی ئیمپراتۆرە گەورەکان سوودیان لێدەبینرا، دیارترینیان ئایینی مەسیحی (نصرانی)یە، بەتایبەت دوای ئەوەی لە ساڵی (٣٩٥ ز) وەك ئایینی رەسمی ئیمپراتۆری رۆمای رۆژهەڵاتی ناسێنرا، لەوێوە پەیامەکەی عیسا پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) بەرەو لاوازی چوو، ئەمەش پەیوەندی بەو دونیاپەرستیەی پیاوانی کەنیسەوە هەبوو، کە دوورکەوتنەوەیەکی زۆر لە ئایینی رەسەنی مەسیحی دروست بوو.

بۆیە لە سەدەی حەوتەمی زایینی "کە ئیسلام دێت و بانگەشەی دوائایینی رادەگەیەنێت، بانگەشەی کاملترین شێوەی تاك خودایی دەکات، ئەوە مەسیحییەتە کە ئەم بانگەشەو بانگەوازە وەك پایەماڵکردنی هەموو پیرۆزییەکانی خۆی سەیر دەکات، هەر بۆیەش لە سەرهەڵدانی ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ کڵێسای مەسیحییەت، نەیتوانیوە ئیسلام وەك ئایینێك قبوڵ بکات". [٢]

لەگەڵ ئەوەی لە رووی هێزەوە ئایینی مەسیحی بەهێز بوو، بەڵام دوای ئەوەی بوو بە ئایینی رەسمی ئیمپراتۆر، وەك هێز و بەشێك لە پڕۆسەی چەوساندنەوەو ماندووکردنی خەڵکی دەردەکەوت، بەرپرسانی

ئیمپراتۆریـەت لەسـایەی مەسـیحییەتدا بەرژەوەنـدی و کـاری خۆیـان ئەنجام دەدا.

بـەبڕوای هەنـدێك لـە نووسـەرانی ئیـسلام، ئـایینی مەسـیحی لـەو سەردەمانەدا، نەك هەر نەیتوانی ژیـانی خـەڵکی باشـتر بکـات لـە رووی کۆمەڵایـەتی، دادپـەروەری و پێکەوەژیانـەوە، بەپێـچەوانەوە، خـەڵکی ژیانی بەرەو خراپتر ڕۆشت و نەیتوانی بتپەرستی لـە ناوببـات کـە وەك پەیامی ئایینی دژایەتیان دەکرد، بگـرە پـەیامی ئایینەکـەیان شـێواند و بـوو بـە بەشـێك لـە بتپەرسـتی و لادان لـە بنـەماکانی خـۆی، ئەمـەش بەپێچەوانەی ئیسلامەوە، بە گوڕ و توانایەکی زۆرەوە هاتە مەیـدان کـە بتپەرستی بەرەو قۆنـاغی کۆتـایی بـرد و بیروبـاوەڕ و بنـەماکانی خـۆی پتـەوترکرد.[٣] { ئیـسلام لـە ناوچـەکانی نیـشتمانی عـەرەبی و ئـەو شوێنانەی کە کۆنترۆڵی دەکرد، بتپەرسـتی لاوازکـرد، نـەك لـە ناوچـە و کیشوەرەکانی دیکە بەو شیوەی کە باس دەکرێت } .

هـەروەها بەشـێکی دیکـە لـە لاوازی جیهـانی ئـایینی مەسـیحی لـەو سـەردەمە لـە بەرانبـەر ئیـسلامدا، پەیوەنـدی بەلایـەنی تاکەکـەس و کـەلتووری ئـایینی مەسـیحییەوە هـەبوو، چـونکە هەنـدێك لـە ڕاهیـب و کەسانی دەسەڵاتداری ئایینەکە، کۆمەڵگەیان بەرەو ئەو ئاڕاستە دەبرد، بەرژەوەنـــدییان تێیـــدا بـــوو و دەیانویـــست، هـــەروەها لـــە رووی کۆمەڵایەتییەوە، ئەو ئایینـە لـێکترازان و داڕزانـی بـەدواداهات، بـەوەی ڕێژەیەکی زۆر ئامادەیی پڕۆسەی ژنهێنان و هاوسـەرگیری نـەبوون، کـە ئامانجی دیکەیان لە راهیب بوونیان هەبوو. ئەوان بەو حاڵـەوە گرنگیـان

بەپاك و خاوێنی جەستە نەدا و پێیانوابوو، بۆ ئەوەی رۆح پاك بێتەوە، پێویستە جەستە پیس بێت، ئەم بیرکردنەوانە زیانێکی زۆری بەسەر کۆمەڵگەدا هێنا کە بەتەواوی لە جیهانێکی خەیاڵی و دوور لە واقیعدا دەژیان.[٤]

لەلایەکی دیکەوە، ئیمپراتۆری رۆم (قوستەنتین) رێگەیەکی مێژوویی مەترسیداری گرتەبەر، کە بەشێك بوو لە شێواندنی ئایینی مەسیحیەت، ئەویش بە گۆڕینی کۆمەڵێکی رۆحیی بۆ ڕێکخراوێکی بەهێز و دەسەڵاتی سیاسی بەخشیە کڵێسا و سروتە ئایینییەکان، شێوازێکی رازاندنەوەیان وەرگرت، لەمەشدا پەنا برا بۆ وەرگرتنی چەند شێوازێکی بتپەرستی رۆمانی لە سەدەی چواری زایینیدا.[٥] لەوێوە ئایینی دامەزراوەیی دەستیپێکرد و پەیامەکەی عیسا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، خرایە لاوە و دەسەڵاتی کڵێسا هاتە پێشەوە، بەڵام ئەوانەی کە دەبوونە راهیب لەژێر رەحمی دەقەکانی حەزرەتی عیسادا دەبوون، ئەمە گەیشتە ئەو راددەیەی هەندێك تیرە و رێچکە و رەوتی مەسیحی خۆیان دەخەساند (خۆیان لە پیاوەتی دەخست)، دووردەکەوتنەوە لە ژنهێنان و لاوازبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەمە لای تیرەی ڤالیرانی (valeriani ) بوونی هەبوو، کە تیرەیەکی مەسیحی بوون و گرنگییان بەم لایەنە دەدا، ئەوان تەنیا خۆیان نەدەخەساند و خۆیان لەپیاوەتی نەدەخست، بەڵکو ئەمەیان بەسەر خەڵکانی دیکەشدا دەسەپاند، ئەم دیاردەیە هەتاکو سەدەی نۆزدەیەم بەردەوام بوو، دواتر قەدەغەیان کرد.[٦]

هەروەها دەسەڵاتی پاپا و ململانێیان لەگەڵ سیاسییەکانی ئەوکات هۆکارێکی دیکە بوو کە کێشەی بۆ ئایینی مەسیحی دروستکردبوو، چونکە زۆرینەیان لەژێر پەردەی ئاییندارى خەریکی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان بوون، بۆیە دەبوایە هەموو سیاسییەك لەژێر فرمانی ئەواندا بێت، بەمەش ئایین بەرەو پاشەکشێ دەچوو.[٧]

لەبەرانبەردا بزووتنەوە گەورەکانی فتوحاتی ئیسلامی بەردەوام سەردەکەوتن و یەهودی و مەسیحییەکانی نیمچەدوورگەی عەرەب دەسەڵاتیان نەما و کەوتنە ژێر دەستی موسڵمانان و لەناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی زایینی، تەواوی ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆری ساسانییەکانی ئێران، بەشێکی زۆر لە دەسەڵاتی بێزەنتین و باکووری ئەفریقیا فەتحکران‌و گەیشتوونەتە دەروازەی قوستەنتین (ئیستەنبوڵ)، ئەوەی موسڵمانان ئەنجامیاندا بە گوڕوتینێکی ئایینی بەهێز و شێوەیەکی دیکە لە بەڕێوەبردن، برووسکەئاسا بڵاوبوونەوە، کە ئەمەش نزیك دەبێت لە شێوازی هاتنی ئەسکەندەی مەکدۆنی بەرەو ئاسیاو رۆژهەڵاتی ناوین.[٨] وەك چۆن بە شێوەیەکی خێرا توانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوکاتی ئێران و میسر و چەند ناوچەیەکی دیکە کۆنترۆڵ بکات.

خاڵێکی دیکە کە لەو سەردەمەدا موسڵمانان سوودیان لێبینی، ئایینی ئیسلامیان وەك ئایینێکی گەردوونی و پەیامێك بۆ مرۆڤایەتی دەناساند، کە هەموو کەسێك دەیتوانی موسوڵمان بێت، بەڵام مەسیحییەکان ئایینەکەیان بەرەو گۆشەگیری دەبرد، بەو پێیەی

مەسیحی ئایینێکە دەرکەوتەی خاکی ئاسیا و ڕۆژهەڵاتە و ئایینی ئیمپراتۆری بێزەنتین بووە کە هەرسێ خاکی ئاسیا، ئەوروپا و ئەفریقای لەخۆگرتووە، لەهەمانکاتدا لە ئاسیاوە بەرەو ئەوروپا ڕۆشتووە و ئایینی یۆنان و ڕۆمای کۆن نەبووە، کەچی ڕۆژئاواییەکان ئایینی مەسیحی دەبەنە نێو ئەو ئیمپراتۆرانە و لە ئایینی ئیسلام دووریدەخەنەوە و بەدوور دەیگرن کە مەسیحی ئایینی ڕۆژهەڵات و ئاسیا بووبێت.

هەروەها لە ئەنجامی فتوحاتی ئیسلامی ترس و نائارامی بەرۆکی مەسیحییەکانی گرتەوە، چونکە موڵك، ماڵ و میراتی چەند ساڵەیان لەدەستدا، بە لە دەستدانی شارستانیەتی ئەوروپا، واتە لەدەستدانی بەشێك لە شکۆی سەرکەوتنیش بۆ هەرلایەك، واتە بردنەوەی گرەوەکەو مسۆگەرکردنی ستراتیژییەتە.[٩] جگە لەوەی پەیامی ئایینی لەپشتەوە بوو، چونکە ئاسان نەبوو بۆ مەسیحییەکان، ئایینێکی دیکە بێت و بانگەشەی تاکخودایی و یەکتاپەرستی بکات، خەڵکەکەی باوەڕێکی بەهێزتریان هەبێت و خۆبەخشانە بجەنگن، بە پێچەوانەی مەسیحی کە زیاتر کار بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان دەکرا.

لەو نێوەندەدا لەگەڵ فراوانبوونی فتوحاتی ئیسلامییدا و ڕۆشتن بەرەو ئەوروپا، ئەوانیش بەجۆرێکی دیکە بەرەو ڕۆژهەڵات دەهاتن، بەڵام هاتنی ئەوان بە چەك و هێزەوە نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی دیکە، هاتنی ئەوان دابڕان بوو لەو دونیا ئایینیەی، کە ڕۆژهەڵات ڕۆچووبوونە ناوی، ئەوان بەدوای هۆکارێك دەگەڕان بۆ زاڵبوون بەسەر ڕۆژهەڵات و

کۆتاپێهێنانی ململانێ، دواتـر ئاڕاسـتەکردنی ڕۆژهـەڵاتی و موسـڵمانان، وەك ئەوەی دەیانویست، هەروەها ڕۆژئاواییەکان لەلایەنی تەکنـەلۆژی، زانستی و داهێنانی نوێ نزیکدەبوونەوە، تا ئەوەی لە دوای ڕێنیـسانس و سەردەمی ڕۆشنگەری، ئەوروپا پێینایە قۆناغێکی دیکە، دواتر توانیان بچنە ناو ژیانی ڕۆژهەڵاتییەکان.

لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتاوە موسڵمانان توانیان ستراتیژییەتی ئەوروپا بخەنـە مەترسـیەوە و بەشـێکی زۆر لـە چـەند وڵاتێکـی ئـەوروپایان کـۆنترۆڵکرد، وەك بەشـێك لـە ئیـسپانیا، ئیتالیـا و فەڕەنـسا، لەمەشـدا ئەگـــەر ئەوروپیـــەکان بەخۆیانـــدا نەچـــونایەتەوە و خۆیـــان ڕێکنەخستایەتەوە، ئەوا بەتەواوی دەکەوتنـە ژێـر مەترسـی هـەژموونی ئایینی ئیسلامەوە، بەڵام لـەدوای چـەند قۆناغێـك لـە ڕووبەڕووبونـەوە، زانیـان چـۆن هـەژموون بەسـەر ئیـسلامدا دەکـەن، ئـەوەیش بـە چـەند ڕێگەیەك بوو وەك ئەوەی لەخوارەوە باس دەکرێت.

### بەئاگاهاتنەوەی مەسیحییەت لە هەمبەر هەژموونی ئیسلام

پـەرۆشـیو بەدواداچـوون و کۆکردنـەوەی زانیـاری شـوێنکەوتووانی ئـــایینی مەســـیحیو بەتایبـــەت توێـــژەرو ڕۆژهەڵاتناســـەکانیان و بەئاگاهاتنەوەیان بەرانبـەر ئیـسلام، لـە خـۆوە نـەبوو، یـان لـەکتوپڕ و بێبەرنامە نەبوو، دەبێت باس لەو ئامـاژە سـەرەتاییانە بکرێـت کـە وای لێکـردن لـەبارەی ئیـسلامەوە زانیـاری کۆبکەنـەوە، بـەجۆرێك یەکـەم ڕاچڵەکینی ئەوروپا و ڕۆژئاواییەکان بەرانبەر بە ئایینی ئیسلام، هەوڵدان

بـوو بـۆ زانیـاری کۆکردنـەوە، ئەمـەش لـە دوای نامەکـەی پێغەمبـەری ئیسلام (سڵاوی خوای لێ بێت) دێت کە بۆ (هەرقل) ئیمپراتۆری گەورەی ڕۆمەکانی نوسیووە. ئەمـە لـە پێـشتر باسـکرا، بـەڵام پێویـست دەکـات لێـرەدا بـۆ مەبەسـتێکی دیکـە بەکاربهێنرێتـەوە، هـەروەك لەنامەکـەدا، پەیامبەری ئیسلام داوای لە هەرقل، کردووە ئایینی لە مەسیحییەوە بۆ ئیسلام بگۆڕێت بۆ ئەوەی ئیمانـدار و پـارێزراو بێـت. بـۆ خوێندنـەوەی زیاتر بڕوانە، صفي الرحمان المباركفوري: لاپەڕە ٢١٤.

ئەم داواکارییە لەو کات قورس دەکەوت لەسەر هـەرقل، بـەم پێیـەی خاوەنی یـەکێك لـە گـەورەترین ئیمپراتۆرەکـانی جیهـان بـوو، کـەمبون ئەوانـەی دەیـانتوانی بەرانبـەری بووەسـتنەوە، چ جـا داوای گـۆڕینی ئایینی لێبکرێت، بەتایبەت لەلایەن کەسێکەوە کە پێشتر نـە پـشتیوانی هەبوو کە بتوانێت ڕووبەڕووی هەرقل بێتەوە، نە ناوبانگ و نە هێزێکـی ئەوتۆی هەبوو! بۆیە هـەرقل لـەوێوە کەوتـە سـۆراخکردنی ئـەو کەسـە (پەیامبەری ئیسلام)، ئایینەکەی و چەندین لایەنی دیکە.

ئەمەش بـە پرسـیارکردن، لـە ڕێگـەی ئـەو کاروانانـەی عـەرەب کـە دەچـوونە خـاکی ئیمپراتۆرەکـەی و ئـەو کەسـانەی زانیارییـان لەسـەر ئیـسلام هــەبوو، ئەمــە ڕێگــەی خۆشــکرد بــۆ کەســە بــاوەڕپێکراو و بــەتواناکانی ئیمپراتــۆر تــاکو زیــاتر بەدواداچــوون بکــەنو خۆیــان لــە تەسلیمبوون بەو ئایینە بپارێزن.

دواتر جموجـوڵی ئـەو کەسـانەی کـە بـە پـەرۆش بـوون بـۆ زانیـاری کۆکردنـەوە لەسـەر ئیـسلام زیـاتر بـوو، دیارترترینیـان ئـەو کەسـانەی

جیهانی مەسیحی کە کاریگەری هەتاکو ئێستاش لە نووسینەکانیاندا بەسەر خەڵکیەوە هەیە، وەك: (جۆن دیمەشقی) یان (یوحەننا دیمەشقی) (john of Damascus)، ساڵی (٧٤٨ ز) مردووە، ئەمیش پێشتر باسکراوە، کە لێکۆڵینەوەی لەسەر ئیسلام کردووە، ئەو زانیارییەکی زۆری لەسەر ئیسلام کۆکردووەتەوە.

بەبۆچوونی هەندێك لە مێژوونووسان، سەرەتای کاری رۆژهەڵاتناسی بۆ یوحەننا دەگەڕێتەوە، بەوپێیەی لێکۆڵەرێکی مەسیحی بوو، بەڵام یوحەننا خەڵکی رۆژهەڵات بوو، مەرجی رۆژهەڵاتناسی تێدانەبوو، کە ئەو کەسەی کاری رۆژهەڵاتناسی دەکات دەبێت رۆژئاوایی بێت و توێژینەوە لەسەر رۆژهەڵات بکات، یوحەننا لە نووسینەکانیدا شوێنکەوتووانی ئایینی مەسیحی لە گەشە، بەرفراوانبوون و هێزی ئیسلام ئاگادارکردووەتەوە، بۆ ئەو ئاگاداری و وریابوونەوەیان، بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ئیسلام، دەبێتە مەزهەبێکی بتپەرستی و مەککەو مەدینە دەبنە پەرستراویان.[١٠]

ئاشکرایە بەشێك لە قسەکانی جۆن، لە دەرەوەی چوارچێوەی کاری زانستییە، چ لەو کات و چ ئێستاش، بەڵکو بۆ مەبەستی ناشیرینکردنی ئیسلام بووە، لەبەرئەوەی جنێو و تەشهیری تێدایە، ئەمەش وەك کاردانەوەیەك بوو لەو کات کە دەیبینی ئیسلام لە فراوانبووندایە و هەندێك لەمەسیحییەکان دەبنە ئیسلام، هەروەك پێشتریش باس کراوە، رەنگە ئەمە لەلایەکەوە مافی مەسیحی و ئایینەکانی دیکە بێت بانگەشە بۆ ئایینەکەیان بکەن و پەرەی پێبدەن، بەڵام لەسەر حسابی سوکایەتی

نەبێت بە ئایینێکی دیکە، جا بە هەر ڕێگەیەك بێت، دیارە لە لایەن هەندێك لە موسڵمانانەوە بێڕێزی بەرانبەر بە ئایینی مەسیحی و شوێنکەوتووانی کراوە، ئەمە بە تەنیا شوێنکەوتووانی مەسیحی نەیانکردووە.

ئەوەی جۆن، باسی کردووە، تا سەدەکانی دواتریش وەك سەرچاوە لە نووسین و قسەکردن سوودی لێبینراوەو بەکارهێنراوە، ئەو جۆرە لێکدانەوە و نووسینانە لەلایەن نووسەر و ڕۆشنبیرانی هەردوو ئایینەکەوە دۆخێکی دوژمنکارانەی بەرهەمهێناوە.

ئەو هەوڵەی موسڵمانەکان بۆ گۆڕینی ئیمانی مەسیحییەکانو سوکایەتیپێکردنی ئیسلام لەلایەن هەندێك لە مەسیحییەکانەوە، لەوێوە پەیوەندی نێوان ئیسلام و مەسیحی هەمیشە بەیەکدا هەڵگژان و هەڵچووندا بووەو هەریەکەیان "ئەویتر" بووە بۆ بەرانبەرەکەی.[11] ئەوی تر بەو مانایەی خۆیان لا پەسەند و پیرۆز بووەو بەرانبەرەکانیان "ئەویتر" لاواز و ژێردەست و بچووك، بەتایبەت لەو کاتەی دەسەڵاتدارانی مەسیحی، دەیانوویست هەموو خاکی ڕۆما بگرنەوە و خەونی بەرفراوانیان هەبوو، بەتایبەتر لەو ناوچانەی بتپەرستی تێدا زۆر بوو، بەڵام بە هاتنی ئیسلام ئەو خەونەیان بەتەواوی لەناوچوو.

دەکرێت ئەو بۆچوونەش بخرێتە ڕوو، کە پێیوایە: "لەو سەردەمەدا ڕۆژئاوا نەیتوانی ململانێی شارستانیەتی ئیسلام بکات، چونکە ئەورووپا دیموکراسیەکی نەگیرساوی هەبوو کە لەلایەن هۆزەکانەوە بەڕێوە دەبرا. *(لە سەدەکانی ناوەڕاست ئەورووپا لەلایەن پاشاکانەوە*

*بەهاوکاری کەنیسە بەڕێوە دەبرا، نەك هۆزەکان، بۆیە مەبەستی نووسینەکە ڕوون نییە و دژیەکی تێدایە).* لەنێو خۆیاندا پارچە پارچەبوون، لەبەرانبەر ئەمەدا ئیسلام ئەزموونێکی زۆری هەبوو، شارستانیەتێکی بەهێزی لەپشت بوو، هەروەها متمانەیان بەخۆیان هەبوو چونکە نوێنەرایەتی دوائایین دەکەن و زۆر جیهانبیین بوون. جگە لەوەی لە رووی بازرگانییەوە بالادەستبوون و رێگاکانیان کۆنترۆڵ کردبوو، ئەم بارودۆخە و هەرەشەی شارستانیەتی ئیسلام قەیرانی بۆ شارستانیەتی ئەوروپا دروستکردبوو بەتایبەت دوای فەتحکردنی ئیستەنبوڵ *(شاری ئیستەنبوڵ، یان قوستەنتین لە ساڵی (١٤٥٣ ز)، لەلایەن سوڵتانی عوسمانی محەممەد فاتیح، دەستی بەسەردا گیرا، مەسیحیەکانی ئەو شارە بەرەو ئیتالیا هەڵهاتن،* بەمەش ئیتالیا بووە سەنتەری کۆبوونەوەی ئەوروپییەکان و دەستکردن بە بازرگانیو دۆزینەوەی ڕێگەچارەی دیکە". (١٢)

## ئیتالیا وەك ناوەندی بەئاگاهاتنەوەی مەسیحی بەرانبەر ئیسلام

لەگەڵ فراوانبوونی فتوحاتی ئیسلامیو ڕۆشتن بەرەو ئەوروپا، ململانێی هەردوو بلۆك، زیادیکرد، بەجۆرێك رۆژئاواییەکانیش بەشێوازێکی دیکە بەرەو رۆژهەلات دەهاتن و دەستیان بە قولایی جیهانی ئیسلامی گەیشت و لەوێوە بەشێوەی پرۆسەیەکی هێواش، خەریکی گواستنەوەی میراتی رۆژهەلات و ئیسلام بوون، بەلام هاتنی ئەوان بە چەك و هێزەوە نەبوو، بەلکو بەشێوەی کۆکردنەوەی زانیاری

و نووسین و توێژینەوە بوو، هاتنی ئەوان دابڕان بوو لەو جیهانە ئایینیەی کە رۆژهەڵات ڕۆچوبووە ناوی، بەوپێیەی کاری ئەوان لە رێگەی پڕۆژە و بەرنامە و کاری پلان بۆ دانراو، بوو.

بەجۆرێك دەکرێت بوترێت، ئەوەی لەئێستادا رۆژئاوا بەدەستیهێناوە بناغەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کات، لە بەرانبەردا دارووخانی رۆژهەڵات و بەتایبەتی جیهانی ئیسلامی کە ماوەی زیاتر لە پێنج سەدە دەبێت پەیوەندی بەو شێوە توندڕەوی رەتکردنەوەی بەرانبەرەوەیە، یاخود بەشێوەیەکی تەسك و چەقبەستووو بیریان دەکردەوە.

ئەوان بەدوای هۆکارێك دەگەڕان بۆ زاڵبوون بەسەر رۆژهەڵات و کۆتاییپێهێنانی ململانێ و دواتر ئاراستەکردنی، رۆژئاواییەکان وەك ئەوەی دەیانویست کاریان بۆ دەکرد و بەدەستیانهێنا، هەروەها لە دونیای تەکنەلۆژیا و زانستی و داهێنانی نوێ نزیکدەبوونەوە، تا ئەوەی لە دوای رێنیسانس و سەردەمی ڕۆشنگەری ئەوروپا و دواتر توانیان بچنە نێو ژیانی رۆژهەڵاتییەکان.

لەگەڵ گەشەکردن‌و بەرفراوانبوونی ئیسلام لە رێگەی فتوحات و بازرگانی و لایەنی رۆشنبیرییەوە، لە ئەوروپاش هێواش هێواش بەئاگاهاتنەوە بەرانبەر بە ئیسلام دەستیپێکرد، ئەمەش لە سەدەکانی ناوەڕاست و لەو کاتەوە کاری رۆژئاوا، لە ستراتیژی شەڕەوە بۆ ستراتیژی نووسین‌و لێکۆڵینەوە لەبەرانبەر ئیسلام گۆڕا، لەمەش قوڵتر لە سەدەی یازدە بەدواوە، بەتایبەت دوای شکستەکانی رۆژئاوا لە

شـــەڕی خاچـــدروشمان، بـــە بـــەردەوامی بازرگـــانی و کۆچـــکردنیان بـــۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵات زیـادیکرد، لەهەمانکاتـدا هەنـدێك لـە خـەڵکی ژێـر دەسـەڵاتی دەوڵـەت و دەسـەڵاتە ئیـسلامییەکان بـۆ ئـەوروپا ڕۆشـتن و کۆکردنەوەی زانیاری و تێگەیشتن لەئیسلام زیادیکرد.

توێژینـــەوە و قـــسەکردن لەســـەر ئیـــسلام و ڕۆژهـــەڵات، لـــە وڵاتـــی ئیتالیاوە دەستیپێکرد، ئەمەش لەبەر چەند تایبەتمەندییەکی جیۆگرافی و مێژوویی و ستراتیژیی ئەو وڵاتە.

ئیتالیـــا، خـــاوەنی شارســـتانیەتێکی گـــەورەی ئەوروپایـــە، ئـــەویش ئیمپراتۆری (ڕۆما)یە کە بەردەوام جێگەی شانازی ئیتالی‌و ئەوروپیەکانە و میراتێکی گەورەی ڕۆحییە بۆ جیهان، ئەم وڵاتە شوێنێکی سـتراتیژیی بەهێزی هەیە، بەهۆی نزیکـی لـە کیـشوەرەکانی ئاسـیا و ئـەفریقا، کـە لەگەڵ ئەوروپا پێکەوەیان دەبەستێت، بەو هۆیەوە زوو دەگەیشتنە ئەو کیشوەرانە، هەروەها ئیتالیا زۆرێك لەو مەسـیحییانەی تێـدا کۆبـووەوە کە پێشتر لە ئیمپراتۆری بیزەنتین هەڵهاتبوون و لەوێ بە بازرگانیـەوە، خەریکبوون.

زۆرینـــەی کەســـە هـــەڵهاتووەکانی ژێـــر دەســـەڵاتدارانی ئیـــسلام لـــەوێ گیرسانەوە، توانیان ئیتالیا، بەتایبەت شاری ڤینسیا بکەنـە ناوەنـدێکی بازرگـانی گـەورەو بناغـەی سـەرمایەداری دانـێن‌و خۆیـان لەبەرانبـەر جیهانی ئیسلامی‌و ڕۆژهەڵات نوێکردەوە.

لەمەوە ئەوروپییـەکان لـە ئیتالیـاوە، پـەیامێکی جیاوازیـان هـەبوو بەرانبەر ڕۆژهەڵات و بەتایبەت جیهانی ئیـسلام، بـەجۆرێك لـە بەرانبـەر

بـــەرفراوانی و باڵادەســـتی موســـڵمانان، ڕۆژئـــاوا و ئەورووپییـــەکان، توێژینـــەوەو بەدواداچـــوونیان بـــۆ ئیـــسلام کـــرد، ئەمـــەش بەپێـــچەوانەی موسڵمانان کە زیاتر پشتیان بە فتوحات و شـەڕ دەبەسـت و لـە لایـەنی مەعریفییەوە بەرەو رووخانو داتەپین دەچوون.

لەلایەکی دیکەوە لە ئیتالیاوە پەیوەندی لەگەڵ مەسیحییەکانی ژێـر دەسـەڵاتی موسـڵمانان دروسـتکرا کـە توانیـان زانیـاری زۆر دەربـارەی ئیسلام دەستبخەن، بەجۆرێك توانیان وێنا و پێناسی ئیسلام بکـەن کـە لێکۆڵەران و توێژەرانی ڕۆژئاوا پێویستیان بـەوە بـوو، لەمـەوە توانیـان زۆرترین شیعر و چیرۆك و مێژووی موسڵمانان دەستبخەن.[١٣]

هەروەها چەندین ناوەند و پەیمانگا و دواتر لقی زانکۆ تەرخانکرا بـۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ڕۆژهەڵات، بەتایبـەت ئیـسلام، بەشـێوەیەك چـەندین زانکۆ کۆرسی خوێندنی بۆ ئەم بوارانە کردەوە و چـەندین خوێنـدکاریان بۆ توێژینەوە ئامادەکرد کە لەبەرانبەر فێربوونی زمـانێکی ڕۆژهـەڵاتی و بەتایبەت عەرەبی، پاداشت دەکران.

دیارە یەکەم سەرپەرشتی توێژەرانی ڕۆژئاوا، لەلایەن کەنیسەکانەوە بوو، کـە داوای تێگەیـشتنی وردی ئیـسلامیان دەکـرد، بـۆ ئەمـەش بـە چەندەها دروشم و شێواز خەڵکی ئـەم بوارەیـان دژی ئیـسلام هانـدەدا، یەکێك لەو دروشمانە (دوژمنەکەت بناسە)، کە پێویست بـوو کەسـەکان دوژمنـــەکانیان بناســـن. قەشـــە و زاناکـــانی مەســـیحی لـــە هـــەوڵێکی بەردەوامدابوون بۆ وەرگێڕانو هێنانی سەرچاوە ئیسلامییەکان، یـەکێك لەوانـە قەشـەیەك بـوو بـەناوی (پیتـەر) کـە سـەرۆکی پەرسـتگایەکی

مەسیحی بوو لە کلۆنی ناوەراستی فەڕەنسا، ئەو قەشە رۆڵـی سـەرەکی هەبوو بۆ ئەم هەوڵدانـە. بەتایبـەت ئـەو کاتـەی وایـدەبینی کـە ئیـسلام کـوفر و نابەجێییـە بـۆ مەسـیحی، دواتـر لـە ئیـسپانیاوە دەسـتی بـە لێکۆڵینەوە دەربارەی ئیسلام کـرد. بـۆ زانیـاری زیـاتر لـەبارەی قەشـە پیتەر، بگەڕێوە بۆ Zachary Lockman: Pages 29,30,31

پیتەر، تیمێکی بۆ وەرگێڕانی قورئان و نووسراوە ئیـسلامیەکان بـۆ زمـانی لاتینـی پێکهێنـا، یەکـەم پڕۆژەیـان وەرگێڕانـی قورئـان لەلایـەن پیاوێکی ئینگلیزەوە بوو بەناوی (ڕۆبەرت کیتان)، کە لـە سـاڵی (١١٤٣ ز) تەواوی کرد.[(١٤)].

هـــەروەها دەســـتیان بـــە وەرگێڕانـــی نووســـراوەکانی ئیـــسلام و پێغەمبەری ئیسلام، کرد، ئەمـەش لەلایـەن (پیـدرۆ دی ئەلفۆنـسۆ) کـە ئایینی خۆی لە یەهودیەوە گۆڕی بوو بۆ مەسیحی، دواتر دەسـتیان بـە فێربـوونی زمـانی عـەرەبی و زانیـاری ئیـسلامی، کـرد، پـەیتا پـەیتا تێگەیشتن لە ئیـسلام زیـادیکرد، هـەر ئـەوکات دەربـارەی زانـستەکانی ئەستێرەناســـی، بیرکـــاری، دەرمانـــسازی و فەلـــسەفە زانیارییـــان دەستدەخـست بـۆ ئەمــەش سـوودیان لــە مزگەوتــەکانی ئیـسپانیا و موسـڵمانانی ئـەو وڵاتــە دەبینــی، بەمــەش ســەرمایەیەکی مــاددیی و مەعنـەوییان بەدەسـتهێنا و کاریگـەری زۆری لەسـەر ژیـانی رۆشـنبیری ئـەوروپا هـەبوو، بەتایبـەتی ئـەو کـات کـە نووسـینەکانی ئـیبن سـینا (٩٨٠ـــ١٠٣٧ ز)، ئـــیبن روشـــد (١١٢٦ـــ١١٩٨ ز) بـــە پەرۆشـــەوە دەخوێنرانەوە و گفتوگۆیان لەبارەوە دەکراو کاریگەری زۆریـان لەسـەر

چینێکی دیاری ڕۆشنبیری، سەدەکانی ناوەڕاستی ئـەوروپا هـەبوو.[١٥]
بەڵام ئەمە دواتر گۆڕانی بەسـەرداهات، بەتایبـەت ئـەو کاتـەی کەنیـسە بۆچوونەکانی فەیلەسووفانی ئیسلامی وەك ئـیبن سـینا و ئـیبن روشـدی ڕەتکردەوە.

هەر لەو سەردەمەدا، چـەندین فەیلەسـووفی ڕۆژئـاوایی پـەیـدابوون، وەك: تۆماس ئـەکویناس (١٢٢٥ــ١٢٧٤ ز)، شـارەزایەکی زۆری ئـایینی لەسەر ڕێچکە (مذهب)ی کاسـۆلیك بـوو لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت، کـە چەمك و زمانی لە ئیسلامەوە وەردەگرت. هەروەها ڕۆجەر بیکۆن (١٢١٤ — ١٢٩٢ ز)، یـەکێك بـوو لـە زانایـانی مەسـیحی کاریگـەری پـەیـداکرد، لەگـەڵ چـەند کەسـێکی دیکـەی مەسـیحی دەسـتی باڵایـان هـەبوو لـە زیندووکردنـەوەی کـەلتوور و فەلـسەفەی یۆنـان، بەتایبـەت دەربـارەی ئەرستۆ.[١٦] لەنێو ئـەو کەسـە مەسـیحییانەی کـە شـارەزایی و زانیـاری زۆریان لەبارەی ئیسلامەوە هەبو وەك: (ڕۆجەر بیکۆن) [١٧] یـەکێك بـوو لــەوان، بــەجۆرێك لــەژێر کاریگــەری نووســینی فەیلەسـووفو پیـاوە گـەورەکانی ئیـسلامدا بـوو، بەتایبــەت ئــیبن ســینا، ئــەو هــەر لــەو ســەردەمەوە کاریگــەری لەســەر ڕێــچکەی ژیــانی ئــایینی بــەریتانیا هەبوو.[١٨]

## ئیسلام لە دیدی رۆژهەڵاتناسانەوە:

وەك پێشتر تیشكی خرایە سەر، لەسەرەتاكانی هاتنی ئیسلامەوە، ئەوروپی و رۆژئاواییەكان بۆچوونیان بەرانبەر ئیسلام خستوەتەڕوو، بەڵام بەشێوەیەكی سەرەتایی بووە، یاخود زۆر جار وەك كاردانەوەیەك سووكایەتی تێدا بووە، وەك چۆن هەندێكجار لەلایەن موسڵمانانەوە هەمان كار بەرانبەریان كراوە. دیارە بۆچوونو لێدوانەكانیان بەرانبەر ئیسلام، بەشێكی وەك كاردانەوەیە و دەچێتە چوارچێوەی كاری نازانستیو ئەكادیمی نین، ئەمەش بۆ هەموو رۆژهەڵاتناسان دروست نییە، بەوپێیەی هەموویان ناكەونە نێو ئەم خانەوەو كەمێكیان بۆچوونی بێلایەنانەیان بەرانبەر ئیسلام هەیە.

لەهەمانكاتدا شوێنكەوتووانو پەیڕەوانی ئیسلام، گرنگە ئەوە بزانن لێكۆڵینەوە لەسەر ئیسلام، قسەكردن لەسەر شارستانیەت و ژیارەكەی لەلایەن ئەوروپییەكانەوە، لەدوای چەند قۆناغێكی لێكۆڵینەوە لە رۆژهەڵات دێت، با وا تێنەگەن كە رۆژهەڵاتناسی بە تەنیا واتای لێكۆڵینەوە و بەدواداچوونە ـ یاخود وەك هەندێكیان دەڵێن ـ هەوڵدان بۆ دژایەتیو ناشیرینكردنی ئیسلامو قسەكردن لەسەری، كاری رۆژهەڵاتناسی تەنیا ئەمە بووە، بەڵكو ئەمە بۆچوونێكی ناعەقلانی و دوور لە بۆچوونی زانستییە، چونكە رۆژهەڵاتناسەكان لێكۆڵینەوەیان لەسەر ئایین و نەتەوەكانی دیكەی وەك: نەژادی سامی، نەتەوەی ئاشووری، وڵاتی هیندستان، زمانو فەرهەنگی وڵاتی چین كردووەو

لقیـان بـۆ هەریـەك لەوانـە هـەبوو، وەك: سامیناسـی، ئاشوورییناسـی، هیندۆلۆجی، کردووە.

هــەروەها لــەقۆناغێکی دیکــە و دواتــر لێکۆڵینــەوەیان لــەبارەی کەلتوورناسی، زماننناسی، ئیسلامناسی، ئێرانناسی و کوردناسی، دواتـر لە لایەنەکانی دیکەی زمان و ئایینەکانی دیکەی رۆژهەڵات کردووە.

بەڵام ئـەو وێنـا ناشـیرینەی ئەوروپییـەکان بـۆ جیهـانی ئیـسلامییان دروستکردووەو وەك سەرەتای کاری رۆژهەڵاتناسی دادەنرێت، بە وتەی رۆژهــەڵاتناس (مەکــسیم رۆدنــسۆن) بــۆ ســەدەی یــازدەی زایینـــی دەگەڕێتــەوە، لــەو کاتــەدا ئەورپییــەکان لــە رووی سیاســییەوە شکــستیانهێنا.[19] ئەمــەش روونــتر لــە دوای شــەڕی خاچــدروشمان بەدەردەکەوێت.

هەروەها لە سەدەی دوازدەی زایینی توێژەرە ئەوروپاییەکان روویان لە بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی رۆژهەڵات کرد، بۆ زیاتر تێگەیشتن و رەفتـارکردن لەگـەڵ ئیـسلام، لـە هــەمان سـەردەم، شـەڕی بـە نـاو خاچدروشمان ڕوویدا و ئەوان زیاتر بـە پەرۆشـی کۆکردنـەوەی زانیـاری بوون لەسەر ئەو ئایینە.

دەشێت ئەوەش بوترێت، لەو سەردەمەدا لە نووسین‌و شرۆڤەکانیان وێنەیــەکی جیاوازیــان بــۆ ئیــسلام‌و پەیامبەرەکــەی هــەبوو، بــەڵام هەندێکجار زانیاری دروستیان لەسەری نەبوو، تەنیا لەدیدی خۆیانـەوە ئەو وێنایانەیان کێشابوو.[20] کە نزیك بوو لـە پێـشبینیکردنی داهـاتووی ئیسلام و نەگونجاندنی لەگەڵ ئـایینی مەسـیحی، وەك: جـۆن دیمەشـقی

پێیوابوو بەیەکدادانی ئیسلام و ئەوروپییەکان دەبێت { *لە هەندێك شوێن وشەی مەسیحی و ئەوروپا بەیەکەوە دەبەسترێت، وەك پێشتر باسکرا، ئایینی مەسیحی، زیاتر وەك ئایینی ئەوروپا دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەی ڕێژەیەکی زۆر مەسیحی لە ئەفریقا و ئاسیا هەیە* } ئیسلام ئایینێکی بەتەواوی جیاواز دەبێت و جۆرێتی ژیانیان لەگەڵ ئەوروپییەکان ناکۆك دەبێت.[21]

بەشێکی زۆر لە ئەوروپییەکان لە توێژینەوەکانیاندا، خۆیان وەك خاوەن شووناسو کەلتووری بەرز ناساندووەو ئیسلامیش وەك "ئەوی دیکە" هەندێك لەمانە درێژەیان پێداوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ، کە لە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە و فیلم و بڵاوکراوەکانیدیکە بەردەوامن، شکۆ بە خۆیان دەبەخشن، لە بەرانبەردا ئیسلام وەك ئەوێکی تووڕە و شەڕانیو خوێنڕێژ و تۆقێنەری جیاواز لە ئەوروپییەکان نیشان دەدەن، دیارە ئەم بۆچوونانە ڕەگێکی قوڵیان بە مێژوو و شارستانیەتدا چووەتە خوارەوە.[22]

هەندێکی دیکە لەو بۆچوونانە، پێیانوابووە کە سیاسەتی ئیسلام هیچ نییە جگە لە زۆردارییەکی خۆرهەڵاتی، ئابووری ئیسلامی هیچ نییە جگە لە ئاڵوگۆڕی شمەك و پێداویستییە سادەکان، ڕۆحانیەتی ئیسلام هیچ نییە جگە لە پەیڕەویی کۆمەڵێك سرووتی مردوو، هونەری ئیسلامیش شتێکی بێ ڕۆح و ئەبستراکتە، چونکە ئیسلام بەرهەمی عەقڵی سامیە، ئەمەش کێشەیە بۆ ئەو ئایینە، بەوپێیەی نەژادی سامی ڕێگرە لەبەردەم گەشەسەندنی بیری تاکەکەسداو ناتوانن

بیربکەنـەوە[٢٣]. {لێـرەدا ناکۆکییـەك لـە نێـوان ئـەو بۆچـوونەی کـە خـاوەنی ئیقتیباسـەکە دەیخاتـەڕوو لەگـەڵ بۆچـوونی ڕۆژهەڵاتناسـان هەیـە، چـونکە ئـایینی مەسـیحییش ئـایینێکی سـامیە و لـە ڕۆژهـەڵات دابەزیوە، ئەگەر ڕۆژهەڵاتناسێکی مەسیحی بۆچوونی بـەو شـێوەبێت، بۆیە گومان لەم بۆچوونە دروست دەبێت} .

بەپێویستی دەزانین بـاس لـەوە بکـەین هـەردوو بلـۆکی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا، یـاخود لێـرەدا بـاس لـە ئیـسلام و مەسـیحی بکرێـت کـە کاریگەرییان بەسەر یەکەوە هەبووە و هەیە، بەڵام لەلایەنی جیاوازەوە، بـەجۆرێك کـە شارسـتانیەتو نـەریتی ڕۆژهەڵاتییـەکان و کـەلتووری ئیسلامی کاریگەری بەسەر کەلتووری ڕۆژئاواوە هەیە.

بەپێچەوانەشەوە، هەروەك نووسەرێکی ئیسلامی ڕۆژئاوایی پێیوایە: " لـە جیهانـدا، هونـەر لـە ناوچـە دواکەوتووەکانـەوە بـەرەو ناوچـە پێشکەوتووەکان دەڕوات، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەچێت بۆ ڕۆژئاوا، یاخود لە باشـوورەوە بـۆ بـاکوور دەڕوات، بـەڵام زانـست پێـچەوانەی ئەمەیـە، شتەکان بەشێوەیەکی عادەتی لە ناوچەی پەستان بـەرزەوە دەجـوڵێن بەرەو ناوچەکانی پەستانی نزم، پاشان مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی و مۆسـیقا سـەماییەکانی هنـدۆس و ئەفریقییـەکان خەریکـە دەچـنە نێوجەرگـەی ئەوروپاوە".[٢٤]

لەمـەوە دەبێـت ئـەوە بەئاسـایی وەربگیرێـت کـە ڕۆژئـاوا زانـستی بەرهەمهێناوە، ڕۆژهەڵاتیش خاوەن کەلتوور و نەریتێکی ڕۆحیـی قوڵـە، ئەمـەش ئـەو مانایـە ناگەیـەنێت کـە لـە ڕۆژهــەڵات زانـست نییـە و

ڕۆژئاواییەکان بێ ڕۆحن، بەڵکو قسە لەسەر شێوەیەکی گشتگیر دەکرێت، بەڵام زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، وەك جەستەیەك و جیهانێکی رووت رەفتاریان لەگەڵ ئیسلام و پەیامبەرەکەی و کتێبە پیرۆزەکانی ئەو ئایینەدا کردووە، هەموو هەوڵدانێکیان لە جیهانی دەرەوەی ئایینەکەیە، نەك لایەنی ڕۆحی و مەعنەوی ئەو ئایینە. هەروەك (محەممەد ئارگۆن) دەڵێت: "هەموو ڕۆژهەڵاتناسەکان جگە لە کەمێك، هیچ شوێنەوارێکیان دروست نەکردووە، تا تاوتوێی میتۆد و دڵەڕاوکێی ئەپستۆلۆژیا دەوڵەمەند بکات، تەنیا ئەو واقیعە فیزیکیە بەرهەستانەیان بەلاوە گرنگە، بە واتا خۆماڵییەکانی خۆیان و بە پێودانگی (چوارچێوەی مەعریفەی ویستراو) دەپێون و هەڵیدەبژێرن.(٢٥)

هەندێك لە مێژوونووسانی ئیسلام، تێبینی ئەوە دەکەن، کە زاراوەی ڕۆژهەڵاتناسی لە لێکۆڵینەوەی ئەوروپییەکاندا هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئایینەکان، ئەدەب و نەریتی ڕۆژهەڵاتدا ناکات، واتە هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئایینی ئیسلام و ئایینێکی وەك: بودایی، یان هندۆس نییە. بە بۆچوونی ئەوانی توێژەری موسڵمان، ئەمە هەڵەیەکی ئەنقەستی زانستییە، وەك سوکایەتی بە ئایین و شارستانیەت و فەرهەنگی ئیسلام.(٢٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، د محەممەد دسوقی: لاپەڕە ٨٨.

هەروەها هەندێك لە بۆچوونی فەیلەسووف و ڕووناکبیرانی ئەوروپا، بەنموونە وەردەگرین. کە لەژێر کاریگەری نووسراو، دۆکیۆمێنت، بەڵگەنامەی وڵاتانی بەناو کۆڵۆنیال، داگیرکار (ئیستعمار) و

ڕۆژهەڵاتناسەکاندا بوون، یاخود خۆیان هاتوونەتە ئەو ناوچانە و نووسیویانە، ئەمەش بەس نییە بۆ توێژینەوەی قوڵ، بەوپێیەی لەماوەیەکی کەمدا ناتوانرێت تێگەیشتن و زانیاری ورد بەدەستبخەن.

لێرەدا هەندێك لە نووسینەکانی فەیلەسووفی فەرەنسی (مۆنتیسکۆ) باسدەکرێت، لەگەڵ ئەوەی یەکێکە لە فەیلەسووف و بیرمەندە گەورەکانی ئەورووپا و جیهان، لە سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسییەوە تائێستا کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی خەڵکی هەیە، بەڵام لە هەندێك لە بۆچوونەکانیدا لایەنگری ئاییني مەسیحی و دژایەتی ئیسلام بە ڕوونی دەبینرێت کە لە ژێر بیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسانو بیریارە ئەوروپییەکاندا نووسیویەتی، هەروەك پێیوایە "دەسەڵاتدار و پاشا ئیسلامییەکان بەخوێنساردیەوە خەڵك دەکوژنو لە میللەتی خۆیان دوورن، بەڵام لە ئاییني مەسیحیسدا پاشاکان نابنە هۆی مەرگی خەڵك و بەهۆی تێکەڵاوییان لەگەڵ کۆمەڵگە، خاوەنی هەست و سۆزێکی مرۆڤانەن، لەئاکامیشدا مل بۆ ئەوە دەدەن کە بکەونە ژێر ڕکێفی یاساوە". (٢٧).

ئەگەر بەشێوەیەکی واقیعی لەم بۆچوونەی مۆنتیسکۆ بڕوانرێت، دەزانرێت ناعەدالەتی بەرانبەر ئیسلام دەکات، بەو پێیەی قسە لەسەر خراپی دەسەڵاتدارانی هەردوو ئایینەکە بکرێت، ڕووندەبێت ئەگەر دەسەڵاتدارانی مەسیحی خراپتر نەبووبن، ئەوا باشتر نەبوون. لەگەڵ ئەوەی پەیڕەوانی هەردوو ئایینەکە، کەلتوورێکی جوانیان

جێنەهێشتووە لە شەڕ و کوشتن و توندوتیژی، لێرەدا قسە لەسەر بابەتێکی دیکە دەکرێت شوێنی ئەوە نییە درێژە بەو باسە بدرێت.

هەروەها ئەو فەیلەسووفە فەڕەنسیە ئاماژە بەوەش دەکات: "کاتێك سەرنج دەدەینە سەر دەرەنجامە ئەخلاقییەکانی مەسیحیەت و ئیسلام، بێدوودڵی ئەو بیرە بە مێشکماندا دێ کە پێویستە ئایینی مەسیحی قبوڵ بکەین، چونکە مەسیحیەت دەبێتە هۆی چاککردنی ئەخلاق، بەڵام ئایینی ئیسلام ئەخلاق بەرەو توندوتیژی پاڵدەنێ".[٢٨] مۆنتیسکۆ لێرەدا ئەوەندەی وەك مژدەبەخش و بانگەوازکارێك بۆ ئایینی مەسیحی دەردەکەوێت، وەك توێژەر و کەسێکی ئەکادیمی نانووسێت و کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئایینی مەسیحی.

لەمەش زیاتر مۆنتیسکۆ دەڵێت: "ئایینی ئیسلام کە بە زەبری شمشێر بەسەر خەڵکدا سەپێنراوە، لەبەرئەوەی بناغەکەی لەسەر جەور و ستەم دامەزراوە، هەر بۆیە بۆتە هۆی سەختی و توندوتیژی، ئەخلاق و رۆحانییەتی، خەڵك بەرەو زەبروزەنگ هاندەدات".[٢٩]

لەبارەی تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیان و کاروباری خەڵکی لە پەرتووکی (رۆحی یاساکان)دا ئەوەش دەنووسێت: "موسڵمانان چونکە ناچارن لەشەو و رۆژێکدا پێنج جار نوێژ بکەن، لەشەو و ڕۆژێکدا پێنج جار هەموو شتەکانی ژیان فەرامۆش بکەن، جگە لە بیری عەبدایەتی، لە بیری هیچی تردا نەبن، بۆیە وا رادێن بەردەوام خەیاڵیان لەسەر نهێنی جیهان و دونیای دیکە بێت، لەئاکامیشدا زۆر گرنگی بە کاروباری دونیا نەدەن، جا ئەگەر حکومەتێکی ستەمکاریش فەرمانڕەوایەتیان بەسەردا

بكات و یاساکانی تایبەت بە موڵکدارییش بەجۆرێك نەبێت کە ئەوان بە موڵکەکانیان ببەستێتەوە، ئەوا لەو کاتەدا هەر بەتەواوی پشت دەکەنە کاروبارەکانی دونیاو ژیان". [٣٠]

یەکێکی دیکە لە و ڕۆژئاواییانەی بۆچوونی خۆی لەسەر ئیسلام نووسیوە، فەیلەسووفی ئەڵمانیا (هیگڵ)ە، کە ئیسلامی داناوە بەوەی درێژکراو و بەردەوامی یەهودیەتە، هەروەها (شپینلگلەری) فەیلەسووف پێی وایە کتێبی ئەیوب[٣١] نووسینێکی ئیسلامییە.[٣٢] ئەمەش ڕەنگە بەو شێوە خوێندنەوەی بۆ بکرێت وەك چۆن کتێبە پیرۆزەکەی ئەیوب پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پڕکرا لە خورافات، ئیسلامیش تێکەڵەیەکە لە شیعر و نووسینەکانی سەردەمی پێشتری، بەڵام لەو سەردەمانەدا ژمارەیەکی کەمی ڕۆژهەڵاتناسان زانیاری دروستو وردیان دەربارەی ئیسلام بەدەستخست بوو، بۆیە لەمەوە وێنایەکی ئیسلامیان خستە ڕوو کە لەلایەن پیاوانی ئایینی مەسیحی و کەنیسەکانەوە پێیان خۆش بوو. بەبۆچوونی توێژەران، لە کەنیسەکانەوە خوێندنەوەیەکی شێوێنراویان دەکرد، قورئانیان وەرگێڕایە سەر زمانی لاتین، وەك ئەوەی خزمەتی بە بەرژەوەندییەکانیان دەکرد، هەروەها ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلامیان بەشێوەی نادروست و نازانستی دەنووسیەوە، بەتایبەت لەلایەن نووسینی کەسانی نادیار و گومان لەسەر و سەرچاوەی دووەمەوە، بەمەشەوە نەوەستاون، چەندین ناوی خوازراو و نازناویان لەو سەردەمەدا بۆ موسڵمانان داتاشیوە، وەك (ساراسێنس)[٣٣] کە یەکێك بووە لەو چەمکانەی وەك سوکایەتی و

بەکەم سەیرکردنی عەرەب‌و موسڵمانان بەکاریاندەهێنا کە تیایدا وەك بەربەری‌و دەشتەکی سەیری موسڵمانانیان دەکردو وەك بتپەرست موسڵمانانیان وەسفدەکرد.(٣٤)

لەهەمانکاتدا زۆرێك لە پیاوانی ئایینی مەسیحی هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام، ئەمەش لەبەر بەرگریکردن و پاراستنی ئایینەکەیان، هەروەك چۆن هەندێك لە نووسەر و توێژەرانی ئیسلامی تا ئێستاش سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی ئایینی مەسیحی دەکەن، واتە ئەوەی کەسە ئایینیەکانی مەسیحی نووسیویانە، بەشێکە لەو ململانێ مێژووییەی کە هەیە، بەڵام هەندێك لە توێژەرە ئەورووپیەکان، تا دواسنوور سوکایەتییان بە پیرۆزییە ئایینیەکانی ئیسلام کردووە، وەك قسەکردن لەسەر پەیامبەرەکەی و دەقە پیرۆزەکانی ئیسلام، لە خوارەوە باس لە هەندێك نموونەیان دەکرێت.

### وێنای پەیامبەری ئیسلام لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسانەوە

پێش ئەوەی بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان بەرانبەر ئیسلام بخرێتەڕوو، بەپێویست دەزانرێت ئاماژە بەوە بکرێت، ئەوان نەك هەر قسەیان لەسەر ئیسلام و پەیامبەرەکەی کردووە، بەڵکو قسە لەبارەی خوا (الله) دەکەن. لەگەڵ ئەوەی هەردوو ئایینەکە پەیامێکی ئاسمانییان هەیە، بەڵام خوای ئیسلام بە خوای مەسیحی نازانن، یاخود بە خوایەکی جیاواز ناوی دەهێنن، کە لێرەدا بەکورتی ئاماژە بەوە دەکرێت.

هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسانو توێژەرانی ڕۆژئاوا، هەرگیز نە پێغەمبەر محەممەد (سڵاوی خوای لێبێت)یان، وەك پەیامبەر قبوڵە، كە وەحی لەلایەن خواوە بۆ هاتبێت، نە بە ئیسلام ڕازی دەبن، وەك ئایینی ئاسمانی، بەڵكو بە بۆچوونیان ئیسلام ئایینی توندوتیژی، خوێناویو دژوار و دڵڕەقیە، سەرەڕای ئەمە ئەو مافە بە مرۆڤی موسڵمان نادەن كە خوا بپەرستێت، چونكە هەندێكیان پێیانوایە حەزرەتی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) كوڕی خوایە، ئەگەر مەسیحییەكان عیسا پێغەمبەر بپەرستن، وەك كوڕی خوا، ئەوا پێویستە موسڵمانان محەممەد بپەرستن وەك خواوەند.[٣٥]

هەروەها دەگەنە ئەو ڕاددەی بڵێن: وێنەی خوای ئیسلام گەردنكەش و خۆبەگەورەزانە، لەهەمانكاتدا خوای مەسیحی خوایەكی میهرەبان و بەخشندەیە، لەمەوە وێنەی عەقیدەی مەسیحی نزیك لە خودا، عەقیدەی موسڵمانانیش بۆشاییەكی هەیە و مرۆڤ دەترسێنن.[٣٦]

هەروەها قسەكردن لەسەر پێغەمبەری ئیسلام، یەكێكە لەو بابەتە بەهێزانەی كە زۆرینەی ڕۆژهەڵاتناسو توێژەرانی ڕۆژئاوا بۆچوونیان دەربڕیوە، بەو پێیەی وەك دواپەیامبەری خوا ئایینەكەی گەیاندووە، بە وتەی زۆرینەی دۆستو نەیارانیشی كاریگەرییەكی گەورەی بەسەر مێژووی ڕۆژهەڵات و هەتا ڕۆژئاواش هەبووەو هەیە، هەروەها ڕۆژئاواییەكانیش بۆچوونیان لەبارەیەوە جیاواز بووەو لەئێستادا جیاوازە، هەروەك چۆن بۆچوونیان لەبارەی ئیسلامیشەوە جیاوازە.

لێرەدا پشت بە بۆچوونی مێژوونوسێکی ئیسلامی دەبەسترێت، بۆ دابەشبوونو پۆلێنکردنی ئەو رۆژهەڵاتناسانەی لەبارەی پەیامبەری ئیسلامەوە نووسیویانە، بەم پێیەی پۆلێنکردنێکی گشتگیرە و بۆ چوار گرووپ دابەشیان دەکات.

دکتۆر (محمد دسوقی) لە پەرتووکی (سير تاريخى و ارزيابى شرق شناسى)، لە پۆلێنکردنیان دەنووسێت:

گرووپی یەکەم: پێیانوایە کە محەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) لە کردار و قسەکانیدا ڕاستگۆ بووەو بەڕاستی وەحی بۆ هاتووە. ئەمانە گرووپێکی بچووك بوون کە تێڕوانینیان لەبارەی پێغەمبەرەوە، کاریگەری زۆری لەسەر کۆمەڵگەکەیان نەبووە، بەڵکو هەندێك لەمانە کەسانێکن لەبەر ئازایەتیو راستگۆییان رووبەڕووی فشارو ئازارو مەینەتی بوونەتەوە"[٣٧]. وەك رۆژهەڵاتناس تۆماس ئارنۆڵد.

گرووپی دووەم: باوەڕیان وایە پێغەمبەری ئیسلام کەسێکی پاك بوو، لە کردار و قسەو هەڵسوکەوتی، بەڵام ئەوەی کە بە خەیاڵیدا دەهات، یاخود گوێی لێبووە، دەیبینی، بۆ خەڵکی دەوتو باسی دەکرد، کە ئەمەش حاڵەتێکی بێئاگاییو بێهۆشی و خەو بوو.

دسوقی لەبارەی هەندێکی دیکەیانەوە کە بە گرووپی سێیەم ناویاندەبات دەنووسێت: "گرووپی سێیەم: لەو بڕوایەدابوون کە محەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) چیرۆكو گێڕانەوەکانی ئایینە ئاسمانییەکانی پێشتر و نووسراوی یۆنانیو رۆمانیەکانو پێشینانی کۆکردووەتەوە و وتوویەتی بە کەسە نزیكو خزمەکانو شوێنکەوتووانی،

پێیوتوون ئەمانە وەحیە، بیانووی بۆ ئەمانەش ئەوە بووە کەسانی دواکەوتوو ئامۆژگاری بکاتو بیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاست".[٣٨] بۆ ئەمەش لە نموونەی ڕۆژهەڵاتناسان (گۆڵدسیهر و شاخن).

لەبارەی گرووپی کۆتاییەوە دەنووسێت: "گرووپی چوارەم: ئەمانە بەتەواوی نکوڵی لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەکەن، نەك هەر گومانی بۆ دروست دەکەن، بەڵکو مێژووی ژیانیو ئایینەکەی دەشێوێنن".[٣٩] لەوانە ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی (هێنری لامنس) (١٧٨٢ـ١٨٣٧ز) بۆچوونەکانی هێندە بەتوندی دەربڕیوە، کە جێگەی ڕەخنەی ڕۆژئاواییەکانیشە.

لامنس هەوڵیداوە گومان لە ساڵی لەدایکبوونی پەیامبەری ئیسلام دروست بکات، باس لەوە دەکات پێغەمبەر، محەممەد (سڵاوی خوای لێ بێت) لە ساڵی (٥٨٠ زایین) لەدایك بووە، کەواتە تەمەنی (٤٠) ساڵ نەبووە و پێغەمبەر نییە، وەك هەموو پێغەمبەران لە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا بوونەتە پێغەمبەر.

دیارە لامنس دەیەوێت گومانێك لەساڵی لەدایکبوونەکە بۆ سەرلێشێواندن دروست بکات، ئەگینا لای زۆرێك لە توێژەران ئاشکرایە کە محەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا لە ساڵی (٥٧٠ زایین) لەدایك بووە، ئەو ساڵەش بە ساڵی فیل بەناوبانگە.[٤٠] ئەمە تەنیا بۆچوونی موسڵمانان نییە، بەڵکو بەشێك لە ڕۆژهەڵاتناسانیش ئەو ڕاستیە دەزانن‌و دەیخەنەڕوو.

لەمەوە زۆرێك لە لێكۆڵەرەوانو ڕۆژهەڵاتناسان كە مامەڵەیان لەگەڵ ئـەو لایەنانـەی تایبـەت بـووە بـە پێغەمبـەری خـوا و ئـاییینی ئیـسلام، كردووە، بە بۆچوونی كەسانێك كـە شـارەزای ژیـانی پێغەمبـەر بـوون و شـارەزان لـە وەحـی، پێیانوایـە ئـەو ڕۆژهەڵاتناسـانە، نـەیانتوانیوە ئاشنایەتی لەگەڵ لایەنی وەحیو جیهانی ناوەوەی ئیسلام پەیدابكـەن، هەروەك پێیانوایە: "لەم بابەتە تێنەگەیشتوون، لەبەرئەوەیـە دەبیـنین ڕۆژهەڵاتناســێك هــاتووە پێغەمبــەری وەكــو كەســێكی بلیمــەتو سەركردەیەك سـەیر كـردووە كـە عەرەبـەكانی یەكخـستووەتەوە، واتـە ڕاهاتوون بە پچڕانی دیاردەی سروش (وحـی) وایـانلێكردووە ژیاننامـەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێـت) بكەنـە زەمینـی، ئێمـە دەبێـت ئـەوەمان لەبەرچـاو بێـت كـە پێغەمبەرایـەتی دیـوێكی ئاسمـانی هەیـە، لەجیاتی ئەوەی پێغەمبەر سەنتەر بێـت، لـە بابەتـە ئایینیەكانـدا خـودا سەنتەرە، بۆیە ئەگەر پێغەمبەر كۆچی دوایی كردووە، وەكو بابـەتێكی مێـژوویی، ئـەوا خـودا بەردەوامـە، ئەگـەر ئـەزموونی پێغەمبەرایـەتیو وەفاتی پێغەمبەر كۆتایی هاتبێت، ئەوا دیاردەی وەحـی تـاكو قیامـەت بەردەوامە". [٤١]

هـەروەها قەشـە ئیلڤـارۆس (Alvarus) لەگـەڵ چـەند قەشـەیەكی هـاوڕێی لەسـەرەتای هـاتنی ئیـسلامەوە، كورتـە ژیـانێكی پێغەمبـەری ئیسلامیان زانیوەو پێیانوایە محەممەد لاسایی ژیانی حەزرەتی عیسای كردووەتەوە، هەروەها هەنـدێك لـە ڕاهیبـەكانی ئیـسپانیا، نووسـیویانەساڵی مردنی پەیامبەری ئیـسلام ئـەو سـاڵەیە كـە هەنـدێك گیانلەبـەران

شۆڕشـــیان دژی مەسـیحی کـردووە، واتـــە لـــەدایکبوونی ئـــەو، دژی مەســـیحییەتە، وێنـــای ئیـــسلام وەك پیلانێکـــی شـــووم بـــووە لای ڕۆژئاواییەکان لە دژی مەسیحی.[٤٢]

لەمەش زیاتر دەنووسن: "هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە محەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) قەشـە بـووە، (پاپـا) لێی تـووڕە بـوو، ئـەوی لـە پۆسـتەکەی دوورخـستووەتەوە، محەممـەد لەکاردانەوەی ئەوەدا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووە".[٤٣]

ئەوەی کە بەرانبەر پەیامبـەری ئیـسلام نووسـراوە، یـان باسـکراوە، تەنیا بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسانو گەڕیدەکان نەبوو، بـەڵکو کاریگـەرییان لەسەر چین و پۆلەکانی دیکەی کۆمەڵگەی ئەوروپا هەبوو، لەهەمانکاتدا هەندێك لـە فەیلەسـووفـو ڕووناکبیرەکانیـشیان بۆچـوونێکی وەك یـەك، یان نزیك لەوانیان هەبووە، هەروەك بەراوردکردنی هـەردوو پێغەمبـەری ئـایینی ئیـسلام و مەسـیحییە، ئـەویش بۆچـوونی فەیلەسـووفێکی وەك (پاسکاڵ)ە کە دەڵێت: "جیاوازی نێـوان عیـسای مەسـیح و محەممـەد، هاتنی پێـشوەختو ڕانەگەیـەنراو بـوو، عیـسای مەسـیح هـاتنی پێـشتر ڕاگەیەنرا بوو، محەممەد کوشتاری دەکرد، پەیڕەوانی مەسیح لەبەر ئەو دەکـوژران، محەممـــەد خوێندنـــەوەی قەدەغـــەکرد، یـــارانی مەســـیح فەرمانیان بە خوێندنەوە دەدا، بەکورتی جیاوازییەکە هێندە گەورەیـە، گەر محەممەد وەدووی سەرکەوتن کـەوت، لـەڕووی ئینـسانییەوە قـسە بکەین ئەوا مەسیح وەدووی مەرگ کەوت... بۆیـە وەك چۆن محەممـەد سەرکەوتنی بەدەستهێنا، مەسیحیش دەیتوانی وابکات، لەجیاتی ئەمە،

پێویسته بڵێین که له‌به‌ر ئه‌وه‌ی محه‌ممه‌د سه‌رکه‌وتوو بوو، مه‌سیح ده‌با بمرێ". [٤٤]

هه‌روه‌ها هه‌ندێك له‌رۆژهه‌ڵاتناسان جگه له ژیانی پێغه‌مبه‌ر، توێژینه‌وه‌یان له‌سه‌ر سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر کردووه، له‌مه‌شدا کاری نازانستی ده‌بینرێت، هه‌ڵبه‌ت له‌مه‌شدا هه‌وڵیانداوه هیجه‌ت بده‌ن به‌ده‌سته‌وه، وه‌ك، به‌شێك له رۆژهه‌ڵاتناسان له‌سه‌ر ئه‌وه هاوڕان که سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر له سه‌ده‌ی دووه‌می کۆچی (سه‌ده‌ی هه‌شتی زایینی) نووسراوه‌و تۆمارکراوه، ئه‌مه‌ش به‌و مانایه‌ی له سه‌ده‌ی یه‌که‌م (حه‌وته‌می زایینی) تۆمار نه‌کراوه، واته نه له سه‌رده‌می په‌یامبه‌ر خۆی و نه له سه‌رده‌می هاوه‌ڵ و هاوڕێیانی بووه، ئه‌مه‌ش وه‌ك باسی ده‌که‌ن به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌یه که هه‌ندێکیان ڕاست نین‌و گومانیان له‌سه‌ره.

هه‌روه‌ها باس له‌وه‌ش ده‌که‌ن که پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووده (حدیث)ـه‌کانی له ته‌ورات، ئینجیل، فه‌لسه‌فه‌ی یۆنانی، حیکمه‌تی ئێرانی و هندییه‌کانه‌وه وه‌رگرتووه.[٤٥] ئه‌وه‌ی رۆژهه‌ڵاتناسان له‌م لایه‌نانه‌وه ده‌یخه‌نه‌ڕوو، دروست نییه به‌شێوه‌یه‌کی توندو نازانستی وه‌ڵام بدرێنه‌وه، به‌و پێیه‌ی ئه‌وان نه باوه‌ڕیان به ئایینه‌که‌ی محه‌ممه‌د هه‌یه و نه هیچ شتێك لایان پیرۆزه، له‌مه‌وه ئه‌وه به دروست ده‌زانرێت ته‌نیا به رێگه‌یه‌کی زانستی راستییه‌کان شرۆڤه بکرێت.

له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌دا، رۆژهه‌ڵاتناسان، تێڕوانینی خۆیان بۆ فیقهی ئیسلامی خستووه‌ته‌ڕوو، که هیچی که‌م نییه له‌و بۆچوون‌و توێژینه‌وانه‌ی به‌رانبه‌ر به لایه‌نه‌کانی دیکه‌ی ئیسلام ده‌یخه‌نه‌ڕوو.

ئەوان (رۆژهەڵاتناسان)، گومان دەخەنە سەرفیقهی ئیسلامی و ئـەم بەشـەی ئـایینی ئیـسلام دەبەنـەوە سەرچـاوەی دەرەکـی، بۆیـە رۆژهەڵاتناسان پێیانوایە فیقهی ئیسلامی سەرچاوەکەی لـە یاسـاکانی ئیمپراتۆری رۆمای رۆژهەڵاتییەوە وەرگیراوە، بە هەندێك هەموارکردن و دەستکارییەوە.(٤٦)

## تێڕوانینی رۆژهەڵاتناسان بۆ قورئان

بەشێك لە رۆژهەڵاتناسان توێژینەوەیان لەسـەر (قورئـان) کـردووە و لەبارەیەوە نووسینیان هەیە، هەندێکیان گومانیان لەوە هەبووەو هەیە، کە قورئان پەیامێکی ئاسمانی بووبێت و لەلایەن خواوە هاتبێت، چونکە کاتێك رۆژهەڵاتناسان، لە لێکۆڵینەوە قورئانییەکاندا لـەو بـاوەڕەدابوون قورئـان دروسـتکراوی مرۆڤـە و لەلایـەن حـەزرەتی محەممـەدەوە نووسـراوە، نـەك لەلایـەن خـوداوە، ئـەو بۆچـوونانەی بـەو شـێوەیەن، بناغەی قورئان بۆ دوو هۆکار دەگێڕنەوە، ئەوانیش: هۆکاری نێوخۆی و دەرەکیە.

مەبەسـتیان لـە هۆکـاری نێوخـۆیی، واتـە بـۆ جیوگرافیـای هاتنەخوارەوەی قورئان لە نیمچەدوورگەی عـەرەبیو ژیـانو کـەلتووری ئـەوان، هـەروەها هۆکـاری دەرەکـی پەیوەنـدی بـە یەهودییـەت و مەسـیحیەت و بـاوەڕو نـەریت و تیتـالی میللـەتانی دیکـەوە هەیـە.(٤٧) مەبەسـت لـەم دوو هۆکـارە بـە مانـای سـوودبینینە لـە دەوروبـەر و جیوگرافیای ناوچەکە، کە چۆن سوودیان لەو ئاییننانەی دیکە بینیوە.

دیاره ئەمە لە ئیسلامدا رەتناکرێتەوە کە ئیسلام سوودی لە ئایینەکانی دیکە بینیوەو تەواوکەری ئەوانە، بەتایبەت ئایینە ئاسمانییەکان، لەهەمانکاتدا هەموو ئایینێك پەیوەندی بە ناوچە و جیوگرافیای دابەزینیەوە هەیە.

مەبەستی ئەو رۆژهەڵاتناسانە کە دەڵێن قورئان لە ژینگەی مەککە و گەرمای بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەوان کاریگەرە، دەیانەوێت بەم بۆچوونانە بانگەشەی ئەوە بکەن کە بنەمایەکی مرۆیی هەیە، لەسەر ئەو بناغەی کە پەروەردە و فێرکردنێکی ناوچەیی و هەرێمیە، تەنیا بۆ هەمان ناوچە باشە و حوکمەکانی لەگەڵ ئەو ناوچەیەدا دێتەوە، بۆ شوێنی دیکە باشە و بانگەوازەکەی بۆ شوێنی دیکە شایستە نییە.[٤٨]

هەروەها هەندێکی دیکە لە رۆژهەڵاتناسان ریشەی سەرەکی قورئان بۆ شیعری (ئومەییەی کوڕی سەڵتە) دەگێڕنەوە، لەبەر ئەوە لەم دووڕێیانەدا لەنێو خەڵکی بانگەوازی یەکیەتی و باسکردنی ڕۆژی دوایی و گواستنەوەی چیرۆکی ژیانی پێغەمبەران بگێڕێتەوە بڕوای پێ بکەن. ئەمەش لێکچونێکی زۆری هەیە لەچیرۆکەکانیاندا، بۆیە بە موسڵمانان دەڵێن، شیعری ئومەیەیان تێکداوەو خوێندنەوەی شیعرەکانیان قەدەغەکردووە، تاکو قورئان لە پێش شیعرەکانەوە بێت و گرنگی بە پێغەمبەر بدەن. لەم بارەوە بڕوانە، (دکتر محمد دسوقی: لاپەڕە ١٥٠ – ١٥٤).

# ئە نجام

بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان بەرانبەر بە ئیسلام، لەلایەکەوە پەیوەندی بەو کەلتووری بەریەککەوتنی نێوان هەردوو بلۆکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و دواتریش ململانێی هەردوو ئایینەکەوە هەیە، دیارە زۆرینەی ڕۆژهەڵاتناسانیش مەسیحیین و ئەگەرچی پابەندیش نەبن پێوەی، بەڵام لەژێر کاریگەری ئایینەکەیاندان، لەلایەکی دیکەوە، بۆ پاراستن و مانەوەی ئایینەکەیان هەوڵی ناشیرینکردنی بەرانبەرەکەیان دەدەن کە ئایینی ئیسلامە، لەهەمانکاتدا بەشێوەی جیاواز موسڵمانانیش سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی مەسیحی دەکەن.

ئەو شەڕ و ئاڵۆزییانەی لە نێوان هەردوو ئایینەکەدا ڕوویداوە، بەشێکی پەیوەندی بەخودی ئایینەکەوە نییە، بەڵکو کەسانێك بوون بۆ پاراستنی دەسەڵات و بەرژەوەندییان هەوڵیان داوە جیاوازی دروست بکەن، نەك خودی پەیامە ئایینیەکان دژی یەکتربن.

پێویستە موسڵمانان ڕێگایەکی دیکە بگرنەبەر بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ڕۆژئاوا و ئەوروپا کە دووربێت لە توندوتیژی و زمانی هەڕەشە، لەبەرئەوەی لە چەند سەدەی ڕابردوو ئەوە دەرکەوت، بەزمانی گفتوگۆ نەبێت ناتوانرێت خۆ لەو قەیرانە ڕزگار بکەن، نەك بە سووتانی بارەگا، باڵیۆزخانە، نوێنەرایەتی وڵاتانی ئەوروپا و هێرشکردنە سەریان.

# پەراوێز و سەرچاوەکان


١. د. حەمید عەزیز: فەلسەفەی زانستی کەلام، هەولێر، چاپخانەی موکریانی، چاپی یەکەم، ٢٠١٢. لاپەڕە ٣١.

٢. فاروق رەفیق: (غەمە جڤاتیەکان)، سلێمانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رەنج، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦. لاپەڕە ٢٥٠.

٣. ابو الحسن علي الحسني الندوي: (بە داڕووخانی موسڵمانان، جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!)، وەرگێڕانی: ئارام گەڵاڵی، چاپی دووەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٢٤٦.

٤. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٤٨.

٥. عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: (ئیسلام لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا)، وەرگێڕانی: محەممەد چیا، سلێمانی، چاپی دووەم، ناوەندی رۆشنبیر، ٢٠٠٢، لاپەڕە ٢٩٥.

٦. عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٠٨.

٧. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥٦.

٨. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراسی، شارستانی سەرمایەداری)، وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەکانی کۆنگرەی گەلی کوردستان (ئاماژە بە شوێن و ساڵی چاپ نەکراوە)، لاپەڕە ١٩٧.

٩. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٠٢.

*10.* Ziauddin Sardar: Orientalism, first edition ،Raj press, New Delhi, 2002، page 18.

١١. عادل باخەوان: (ئیسلام و رۆژئاوا)، سلێمانی، چاپخانەی رەنج، ٢٠٠٦، لاپەڕە ٤٨.

١٢. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٠٣ و ٢٠٤.

*13.* Zachary Lockman: Contending Visions of the Middle East( the history and politics of Oreintalism), new York. Page 29.

*14.* Zachary Lockman: Ibid، page 29.

*15.* Zachary Lockman: Ibid، page 30.

*16.* Zachary Lockman: Ibid، page 31-32.

١٧. رۆجەر بیکۆن: فەیلەسووفێکی ناوداری بەریتانیە، کە بونیاتی فیکری فەلسەفەی ئینگلیزی لەسەر دوو بنەما دانا، هەریەکێکیان سەربەخۆن، ئەوانیش ئەزموونی ناوەوە کە دەبێتە هۆی رۆشنکەرەوەی رۆح و زیاتر لەسەر بنەمایەکی ئایینیە، ئەویدیکەیان زیاتر دەبێتە مایەی حەقیقەتی زانستی کە پشت بە ئەزموونی زانستی دەبەستێت.

لەگەڵ ئەوەی پشتی بە لایەنی ئایینی دەبەست، لایەنی زانستی لەمە نەدەبڕی و هەمان ئەزموونی ئیسلامی دووبارە دەکردەوە.

بیکۆن، هاوسەنگیی لە نێوان هەردوو لایەندا دەکرد، هەربۆیە تائێستاش ئەزموونی ئایینداری و دەوڵەتداری بەریتانیا جیاواز لەوڵاتانی دیکەی ئەوروپا و رێچکەی ئەنگلۆسەکسۆنە و، شێوە گونجاندنێکی زۆری لەگەڵ ئیسلام هەیە، هەر ئەو گونجاندنەیە وای لە بەریتانیا کردووە "دەزگای پشکنین"ی لە چاخەکانی ناوەڕاست نەگرێتەوە.

ئەوەی بیکۆن، کردی دواتـر فەلـسەفەی ئـەو وڵاتـەی لەسـەر بونیـاتنرا، دیارە ئەمەی بیکۆنیش بۆ ئەو فەرهەنگە بەهێزەی هەیبوو کە لە ئیسلامەوە سوودی لێبینیبوو، بەوپێیەی زۆر سەرسام بوو بـە ئـیبن سـینا. بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانــە: عــەلی عیــززەت بیگــۆڤیچ: (ئیــسلام لــە نێــوان ڕۆژهــەڵات و ڕۆژئاوادا). لاپەڕە ٤١٩ و ٤٢٠.

١٨. عەلی عیززەت بیگۆڤیچ،: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤١٩.

*19.* Zachary Lockman ; Op. cit، page 27.

*20.* Zachary Lockman Ibid، page 34.

*21.* Ziauddin Sardar، Op. cit، page, 18.

*22.* Zachary Lockman، Op. cit, page 27..

٢٣. فاروق رەفیق: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٨٠.

٢٤. عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥٤.

٢٥. مەحمود عەزەب: (ئارگۆن و رەخنەی ڕۆژهەڵاتناسی)، وەرگێڕانـی: ئومێد تۆفیق، گۆڤاری کۆچ، ژمارە ٧و٨، ساڵی ٢٠٠٨، لاپەڕە ٣٦٥.

٢٦. دکـتر محمـد دسـوقی: (سـیر تـاریخی و ارزیـابی شـرق أندیـشه شناسی)، ترجمە دکـتر محمـود رضـا افتخـار زادە، تهـران، چـاپخانە، گلـوع ازادی، چاپ أول، ١٣٧٦، لاپەڕە ٨٨.

٢٧. مۆنتیسکۆ: (ڕۆحی یاساکان)، وەرگێڕانی: ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی دووەمو سێیەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەڕە ٥٨٧.

٢٨. هەمان سەرچاوە: لاپەڕە ٥٨٨.

٢٩. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥٨٨.

٣٠. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە. ٥٩٣.

٣١. كتێبی ئەیوب، مەبەست لە ئەیوب پێغەمبەرە (سڵاوی خوای لێبێت)، دواتر شاعیرە عیبرییەکان کتێبەکەیان فراوانکردووەو کردوویانەتە شیعر، کە کار بۆ چەسپاندنی دادپەروەری لەسەر زەوی دەکات. لەم بارەوە بڕوانە عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: (ئیسلام لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا)، لاپەڕە ٣٠١.

٣٢. عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣١١.

٣٣. ساراسێنس، (Saracens): لە وشەیەکی یۆنانییەوە وەرگیراوە، بۆ خێوەت بەکاردەهێنرا، دواتر وشەکە بۆ عەرەبەکان بەکاردەهێنرا، کە بە واتای دانیشتووی خێوەتو بۆ ئەو کەسانەی بیابانیو کۆچەریین، کەسانێك کە توندڕەو و دڵڕەقن، بەجۆرێك ئاگایان لە ژیانی شارستانی نییە.

لەگەڵ ئەوەی ئەم چەمکە بۆ عەرەبەکان بەکاردەهێنرا، بێگومان هەندێك لێکۆڵەری دیکە بۆچوونیان وایە کە ساراسێنس لە وشەی (سارا) خێزانی بچووکی حەزرەتی ئیبراهیم، دایکی ئیسحاق پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وەرگیراوە، بەڵام لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە وەك ئیبتیزازکردنی عەرەبەکان و موسڵمانان بەکاریانهێناوە. بۆ ئەمە بگەڕێوە: Zachary Lockman: Contending Visions of the Middle East( the history and politics of Oreintalism, Page, 25

*34.* Ziauddin Sardar ; Op. cit , page,24.

*35.* Ziauddin Sardar ‹Ibid‹ Page, 24.

٣٦. دکتر محمد دسوقی: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٢٧.

٣٧. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٣١.

٣٨. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٣١.

٣٩. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٣١.

٤٠. نەریمان عەبدوڵڵا: (ڕۆژهەڵاتناسی، دەرکەوتن و ئامانجەکانی)، گۆڤاری کۆچ، ژمارە، ٧ و ٨، لاپەڕە ٢٨٥.

٤١. تەحسین حەمە غەریب: (ئیسلامی کوردی و ریفۆرمی ئایینی)، سلێمانی، بڵاوکراوەکانی خانە و چاپی هەژان، ٢٠١٣. لاپەڕە ٣١-٣٢.

42. Ziauddin Sardar: Op. cit،page19.

٤٣. دکتر محمد دسوقی: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣٠.

٤٤. فاروق رەفیق: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٧٧.

٤٥. دکتر محمد دسوقی: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٢٥.

٤٦. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٥٩.

٤٧. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٢٧.

٤٨. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٥٤.

# بەشی چوارەم

# پێویستی زانستی ڕۆژئاواناسی

# هەنگاوێك بۆ دەربازبوون لە هەژموونی ڕۆژئاوا

# سەرەتا

هەژموونی ئەوروپا و رۆژئاوا، تا ئاستێکە، شوێن نەماوە لە رۆژهەڵات دەستیان پێی نەگاتو قسەی لەسەر نەکەن، لەهەمانکاتدا هیچ رووداوێك بەبێ ئامادەیی و بەبێ بڕیاری رۆژئاوا دەگمەنە ڕووبداتو سەربگرێت.

هەژموونی رۆژئاوا، بەسەر رۆژهەڵات و بەتایبەت جیهانی ئیسلامی، بەرهەمی ساڵێك و دە ساڵ و بگرە سەدەیەکیش نییە، بەو پێیەی چەندین سەدەیە هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێش چوون و کاریان لەسەر ژیانی رۆژهەڵاتییەکان کردووە تا دواجار خاکی وڵاتەکانیان کۆنترۆڵکردووە و کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەشیان هەبووەو هەیە. لەو ماوە دوورودرێژەی مێژووی هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، دەسەڵات و دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە پاشەکشە و بەرەو دوا چوون، لە داڕزانی ماددییو مەعنەوییدا بوون، وەك ئەوەی لە کۆتاییەکانی

سەدەی نۆزدەیەم لە دەوڵەتێکی گەورەی وەك عوسمانی بینرا کە چۆن میراتی بەناو "پیاوە نەخۆشەکە" دابەشکرا.

بەشێکی زۆر لە بەهێزی و هەژموونی ڕۆژئاوا، پەیوەندی بە کاری ڕۆژهەڵاتناسان و توێژەر و گەڕیدە ڕۆژئاوایی و ئەوروپییەکانەوە هەبوو، کە زیاتر لە نۆ سەدەیە کار بۆ ئەو لایەنە دەکەن و لە پێنج سەدەی رابردوو جێدەستیان بەتەواوی دیار بووە، بەڵام لەدوای ئەو ماوە زۆرە و ژێر دەستەیی فیکری ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا، هێشتا دەتوانرێت هەنگاوێك خۆ لەو هەژموونە رزگار بکرێت، ئەویش لە رێگەی ریفۆرمی ئایینی و ریفۆرمی نێوخۆیی وڵاتان، دامەزراندنی لقێك لە زانکۆ و پەیمانگاکان بەناوی ڕۆژئاواناسی، کە دەکرێت لە رێگەیەوە تاکی ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامی بە فەلسەفە و زانستو کەلتووری ڕۆژئاوا ئاشنابن.

ئەمەش پێویستی بەهێز و توانایەکی ماددیی‌و مەعنەویی هەیە، تاکو چیتر ئەو دۆخەی جیهانی ئیسلامی پێدا تێدەپەڕێت تووشی ڕووداوی کوشندەتر نەبێت.

## بەرباسێکی بابەتەکە

چەند سەدەیەك ئەوروپییەکان بە بەشێك لە داهێنان و تواناکانی موسڵمانان سەرسام بوون، لە دوای هاتنی ئیسلامەوە تاکو شەڕی بەناو خاچدروشمان، بەڵام لە ماوەی پێنج سەدەی ڕابردوو تاکو ئێستا (سەدەی بیست و یەك)، موسڵمانان بە داهێنانی ئەوروپییەکان سەرسامن، نەیانتوانیوە بەرەوپێش بچن، بە بەراورد بە گەشەی ئەورووپا دۆشداماون، ئەمەش لەبەرئەوەی وەك چۆن سەرسامبوونی ئەوروپییەکان لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە پەیوەندی بە چەقبەستوویی عەقڵیەتی ئایینی مەسیحی هەبوو کە ئەو کات پیاوانی ئایینی دەسەڵاتی تەواویان لەدەستدا بوو، لەگەڵ ئەوەش چەند هۆکارێکی دیکە هەبوون، لە بەرانبەردا هێشتا ئایینی ئیسلام سەردەمی گەنجێتی و گوڕ و تینی بوو، بزووتنەوەکانی فتوحاتی ئیسلامی بەخێرایی بڵاودەبوونەوەو سوودیان لە کەلتوور و زانستی گەلانی دیکە وەردەگرت، بەهەمان شێوە، سەرسامیی موسڵمانان بە ئەوروپا، لە دوای هاتنە سەر دەسەڵاتی بنەماڵەکانی ئەمەویو عەباسیو دواتریش عوسمانیەکان، وردە وردە هاوکێشەکە پێچەوانە بوویەوە، بەوپێیەی زۆرێك لە خەلیفە و پاشا و سوڵتانەکان بە ژیانی خۆیانەوە خەریکبوونو بەعەقڵیەتی داخراو بیریان دەکردەوە و ئەو داهێنانو دروستکراوانەی ئەوروپایان بە بەرهەمی کافر دەزانیو ڕەتیاندەکردەوە.

هەروەها بەعەقڵیەتی عەرەبچێتی و تورکچێتی بیریان دەکردەوە و مافی نەتەوە و گەلانی دیکەیان پێشێل دەکرد، وەکو پێشێلکردنی ماف

و بەکــەم ســەیرکردنی نەتــەوەکانی: کــورد، بــەلوچ، چــەرکەس و ئەرمەن...هتد. ئەمە بەتەواوی لە سەردەمی بنەماڵەی ئەمەوییەکانـەوە سەریهەڵدا کە زۆر گرنگیـان بـە عەرەبچێتی دەدا. شـێوازی حـوکمڕانی کردنیـان زۆر لەگـەڵ بنـەماکانی ئـایینی ئیـسلام نەهاتووەتـەوەو بگـرە نەگونجاو بووە، وەك ئەوەی کـە بـە شـوورا و راوێـژ نەهاتوونەتـە سـەر حــوکم، هــەم وەك ئــەوەی ژیــان و کرداریــان، بەتایبــەتی چــۆنێتی بەڕێوەبردن و حوکمڕانی پتر بەلای کاری دونیا و دوور لـە ئـایین بـووە، دەســەڵاتیان دەســەڵاتی سیاســی بــووە و هــانی هەســتی عــەرەبی و نەتەوەییان داوە، ئیتر لەو کاتەوە فەزڵی عەرەبیان بەسەر نەتەوەکانی دیکەدا داوە، ئەمە لە تەنیا لایەنێکەوە نەبوو، بەڵکو زۆربـەی کایـەکانی ژیانی گرتبووەوە[1].

ئەو شێوە رەفتارانە پەیوەندی بەو لایەنەوە هەبوو کە عەرەبەکان بە ئــەزموون نــەبوون لــە چــۆنێتی حــوکمڕانیی، لــە پــێش هــاتنی ئیــسلام، خــاوەن شارســتانیەت و کــەلتوورێکی بــەهێز نــەبوون {مەبەســت لــە خــستنەڕووی ئــەم بۆچــوونە پەیوەنــدی بــە هەســتی نەتــەوەیی و رەگەزپەرستییەوە نییە، بەڵکو بۆچوونێکە و دەخرێتەڕوو} .

وەك ئەوە ئیبن خەلـدون باسـی دەکـات، دوای فتوحـاتی ئیـسلامی، چـەندین وڵات و ناوچـەیان کـۆنترۆڵکرد و دەسـتیان بەسـەر ناوچـە بـە پیتەکاندا گرتو خەریکی ژیانی خۆشو کۆکردنەوەی سەروەت و سامان

بوون و نەیان پەرژاوەتە سەر کاروباری کەلتوور و شارستانی و هزری‌و زانست و لایەنەکانی دیکە.[٢]

هەروەها جیهانی ئیسلامی لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەوە بەرەو داڕووخانێکی گەورە دەچوو، چونکە خەڵکی بەرەو خورافات و جیهانێکی نازانستی ئاراستە دەکران، هەروەها باج و سەرانەی زۆر لە خەڵکی وەردەگیرا، لەهەمانکاتدا مافی سیاسی بە خەڵکی نەدەدرا، لە دەرەوەی فەرمانی سوڵتان و خەلیفەکان سیاسەت بکات و سزای بۆ ئەوان نەبێت، گرنگە ئاماژە بەوە بکرێت کە خەلیفە و سوڵتان و پاشاکان لە رەفتار و هەڵسوکەوت‌و بیرکردنەوەیاندا وەك یەك نەبوون، بەڵام نەیانتوانی لە چوارچێوەی تەقلیدی سواوی بنەماڵەکانیان دەرچن، بە ئێستاشەوە دەسەڵاتدار و کەسایەتییەکانی جیهانی ئیسلامی ناتوانن دەربازی ئەو حاڵەتە ببن.

لە بەرانبەردا ئەوروپا بە قۆناغی گرنگدا تێدەپەڕی، لە سەردەمی رێنیسانسەوە بۆ سەردەمی چاکسازی ئایینی‌و سەردەمی رۆشنگەری‌و مۆدێرنە تا دواترینیان، بەڵام جیهانی ئیسلام، هیچ کام لەمانەی نەبینی، بەبێ حسابکردن بۆ شوێن و سەردەم، هەمان ئاییندارى چەند سەدەیەك پێش ئێستا پەیڕەو دەکرێت، ئایینی ئیسلام هیچ کام لەو قۆناغانەی نەبڕی و بە تونێلی چاکسازی تێنەپەڕی، یاخود ژمارەی ئەو کەسانە کەمن جورئەتی ئەوەیان هەبێت بیر لە چاکسازی و دەرچوون لە عەقڵیەتی چەقبەستووی ئایینی بکەنەوە، وەك رۆژهەڵاتی و موسڵمانان

هەست بە خۆیان بکەن، نەك وەك ئەوەی دژی رۆژئاوابن، کە لە هەقیقەتدا پێیان سەرسامن و دەرینابڕن.

ئەوەی پێی دەوترێت ((ئەهلی رەئیو ئیجتیهاد))، لایەنگرانی ئەو بۆچوونو ئاراستەیە بوون جگە لە دەق و ئایەتەکان، قورئان و حەدیس، پشتیان بە بیرو را و بۆچوون و توێژینەوەی ئازاد و ئیتجتیهاد دەبەست، هەروەك سەرچاوەکان باسی دەکەن، ئەم خاوەن بۆچوونانە شرۆڤەی ئەو شتانەیان کردووە کە لەو سەرچاوانەی باسکران بەتەواوی روون نییە بۆ خەڵکی، یان بەشێوەی ئاماژە خراوەتەڕوو، کۆمەڵەی ئیجتیهادەکان لە رێگەی پرسیار و گریمانەوە هەوڵی تێگەیشتنی زیاتریان داوە.[٣] بەڵام زوو سەرکوتکراون، وەك نموونەی موعتەزیلە و خواریجەکان، لەگەڵ ئەو هەڵانەی بەپێی سەرچاوەکان باسی دەکەن کە دەربارەی قورئان و چەند لایەنی دیکە کردوویانە، بەڵام بەتەواوی رێگرییان لێکراوە.

بۆ دەرچوون لەم بازنە کێشراوە پێویستە هەنگاوی جددیی بنرێت، بە جۆرێك بێت بە شکستەکانی رابردوودا بچنەوە، ئەو گرێی خۆبەکەمزانینە بڕەوێننەوە، جا ئەمە لە رێگەی دامەزرانی لق و ناوەندی رۆشنبیری تایبەت بە رۆژئاوا، یاخود چاکسازی لە نێو ئیسلام، کە هەردووکیان پێویستە، بۆ ئەوەی چیتر لە دەرەوە ئاراستەی ژیان نەکرێن و خاوەنی ئیرادەو بۆچوونی نێوخۆ بن.

## ئەو هۆكارانەی بوونە هۆی پاشكەوتنی شارستانییەتی ئیسلام و بەرەو لوتكەچوونی شارستانییەتی رۆژئاوا

لە سەرەتاكانی هاتنی ئایینی ئیسلامەوە تاكو سەدەكانی ١٤ و ١٥ زایینی، ئەوروپا و رۆژئاوا سەرسام بوون بە شارستانییەتی رۆژهەڵاتو ئیسلام، كە تارادەیەكیش كەوتبوونە ژێر كاریگەری هەژموونی ئیسلامو سوودیان لە شارستانیەتەكەیان دەبینی.

ئەمە وایكرد، لە دوادوای سەدەكانی ناوەڕاستدا ئەوروپا دەرگا بۆ چەند لایەنێكی گرنگی كەلتووری رۆژهەڵات بخاتە سەر گازی پشت، هەندێك لە بەرهەمی ئەو ئایینە و رۆژهەڵات گوازرانەوە ئەوروپا، كە بەهۆیانەوە یاساو نەریتی كۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ئەوكاتی ئەوروپا، هاتنە لەرزین، زۆربەی كەلتووری رۆژهەڵاتیش كە لە بنەڕەتدا ئیسلامی بوونو لە رێگای ئەندەلوسو سەقلیە و ئەو وڵاتە عەرەبیانەی كە بە سەر رۆژهەڵاتی دەریای ناوەراستدا دەیان ڕوانی گەیشتە خاكی ئەوروپا. [٤]. بەڵام سەرسامیی ئەوروپییەكان بەجیهانی ئیسلامی و موسڵمانان، پەیتا پەیتا كەمیكرد، ئەمەش دوای شەڕی خاچدروشمان، بەتایبەت لە سەردەمی رێنیسانسی ئەوروپا و دواتر سەردەمی چاكسازی ئایینی، توانیان رەوتی ژیان بگۆڕن لەو كیشوەرەو گرنگییان بە شارستانییەتی ئیسلام نەدا.

ئەووپییەكان، لەوێوە كەوتنە خۆیان بۆ دۆزینەوەی ئەو نهێنیەی كە پێشتر رۆژئاوای لە دۆخێكی چەقبەستوو هێشتبووەوەو ئیسلامی بەرەو پێشو گەشەسەندن برد. ئەوان دوای نائومێدبوونیان لە بەرەنگاری

شەڕو رووبەڕووبونـەوەیان لەگـەڵ ئیـسلام، دەسـتیان بـە ململانێیـەکی دیکـە کـرد، ئـەویش تێگەیـشتن‌و خوێندنـەوەی بەرانبەرەکـەیان بـوو، ئەمــەش پێویـستی بــە پڕۆسـەیەکی دوور و درێـژ بـوو، لەهەمانکاتــدا دەستکردن بە چاکسازی و بەخۆداچـوونەوەو دۆزینـەوەی هەڵـەکانیان، دوای چــەند قۆناغێـك لــەو پڕۆســە، ئەوروپاییــەکان توانیــان بەســەر بەرانبەرەکانیاندا زاڵبن.

دواتـــریش کۆنتڕۆڵیـــانکردن‌و بەکاریانـــدەهێنان، وەك ئـــەوەی دەیانویست، بەڵام تائێستا کێشەی موسڵمانان لەوەدایـە بیریـان لـەوە نەکردووەتەوە، یان بەدواداچوونیان نەکردووە کە بۆ دواکەوتوون؟ یـان لە دۆخێکی چەقبەستووودان‌و چۆن بەرانبەرەکەیان کە ئەوروپایـە بـەو شێوە گەشەی سـەند؟! ئەمـە بـۆ ریفۆرمخـوازان‌و شـارەزایانی وڵاتـانی ئیسلامی‌و رۆژهەڵاتە تا کار بۆ دەربازبوون لەو قەیرانـە قوڵـە بکـەن کـە دەبوایــە بــۆ دۆزینــەوەی هەڵــەکانی ڕابــردوو بــەو شــوێن پێیانــەدا بگەڕانایەتــەوە کــە بــەرەو ئــەو دۆخــەی بــردوون، لەهەمانکاتــدا بەربەستەکانیان بدۆزیایەتەوەو کاریان لەسەر بکردایـە، هـەروەها لـەوە تێبگەشتنایە، چۆن لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە توانراوە بە خێرایـی پەیامی خۆیان بڵاوبکەنەوەو شارسـتانییەتێکی گـەورە دروسـت بکـەن، کەچی ئێستا بوونەتە بارگرانییەك، نەك بەسەر رۆژهەڵاتـەوە بـە تـەنیا، بەڵکو بەسەر جیهانیشەوە؟! وەك ئەوەی پێشتر ئـەوروپا لـەو دۆخـەدا بوو، چونکە ئەوروپییەکان لە سەدەی پێنجەمەوە تا سەدەی دەیەم لە تاریکستان‌و نـەجوڵان‌و گەڕاندنـەوە بـۆ دواوەدا بـوون، کـە دڕنـدەیی و

هەمەجیەتی ئەو سەردەمە لەسەدەکانی پێشتر زیاتر بوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئیسلامیش ئەم دۆخەیان بەسەر خۆیاندا هێنا.[٥]

ئەو دۆخە خراپەی کە ئێستا جیهانی موسڵمانانی تێدایە، مێژوویەکی قوڵی هەیە، دەکرێت بەشێکی بگەڕێنرێتەوە بۆ سەردەمی دوای کۆتاییهاتنی وەحیو کۆچی دوایی پەیامبەری ئیسلام، وەك پێشتر باسمان کرد، ئایینەکە وەك پێویستییەکی سەردەمو رزگارکردنی خەڵکی بوو، بەڵام دواتر چینی دەرەبەگایەتی و چەوساندنەوەی خەڵکی لەسەر دەستی خەلیفە و ئەمیر و والیەکان سەریهەڵدا، بەڵام ئەو دۆخە چەقبەستووەی ماوەتەوە بۆ ٥٠٠ ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوە، بەتایبەت لە سەردەمی رێنیسانسی ئەوروپا و هەژموونی دەسەڵاتی عوسمانییەکان، کاتێك مانایەکی دیکە درا بە ئایینو سنووریان بۆ پێگەیشتن و جوڵە و چالاکی گرت، بەتایبەت لەسەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەمی زایینی کە بە سەرەتای داڕووخانی جیهانی ئیسلام دادەنرێت، بەڵام چەند هۆکاری سەرەکی هەبوو پێویستە بخرێنەڕوو، دواتریش بەجددیی کار بۆ دەربازبوونیان بکرێت، بەو پێیەی لەئێستادا جیهانی ئیسلامی لە دۆخێکی خراپدایە، بەهۆی چەندین گرووپی توندڕەو کە لەژێر چەتری ئیسلامدا شەرعیەت بەخۆیان دەدەن، هەروەها کێشەکانی نێو مەزهەب و رێچکە ئیسلامییەکان کەمتر نییە لە کێشە و ململانێی دوو ئایینی جیاواز، یان ململانێی نێوان خەلیفە و دەسەڵاتدارە جیاوازەکان، وەك ئەوەی لە نێوان خەلیفەی چوارەمی ئیسلام، عەلی کوڕی ئەبوتالیب و مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان روویدا و

بەهۆیــەوە ژمارەیــەکی زۆر لــە شــوێنکەوتووانی ئیــسلام کــوژران. کــە بەشێکی زۆری پەیوەندی بە دەسەڵاتی دونیاییەوە هەبوو، وەك ئەوەی ئیمــامی عــەلی، وەك پیــاوێکی ئــایینی، هزرمەنــد و رۆحــی دادەنــرا، مەعاویەش وەك پیاوێکی سیاسیو دونیایی کە داوای دەسەڵاتی دەکرد، ئەمەش بۆ دەسەڵاتە جیاوازەکـانی دیکـەی ئیسلام راسـتە و هـەبووە، ئەمانە و چەند هۆکارێك کە دڵەڕاوکێی بۆ ئەو بەشەی ئیسلامی میـانڕەو دروستکردووە خۆیان لە توندوتیژی بەدووردەگرن.

بەشــێك لەمــە پەیوەنــدی بــەو بێخەمیــەی ڕێبــەرانو دەزگــا ئیــسلامییەکان و یەکێتییــە ئیــسلامییە نێودەوڵەتییــەکان و ئــەو کەسانەوەیە کە بەناوی ئایینەوە قسە دەکەن، ئەمە یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکییانەی چەند سـەدەیەکە رووبـەڕووی ئیـسلام بووەتـەوە، وەك چۆن پێـشتر خەمـساردی و بێئاگـایی خەلیفـە، مـیر، سـوڵتان، پاشـا و دەسـەڵاتدارانی بنەماڵـە و میرنـشین بـوو، ئێـستا شـێوەیەکی دیکەیـە، بەوپێیـەی ئـەو کاتـەی خەلیفـەی ئەمەوییـەکان و دواتـر عەباسـییەکان خەریکی ژیانی خۆیان بوون، ئایین بەشێك نەبوو لـە خـەمی گـەورەیان، بۆیــە بــەها ئیــسلامییەکان لەناوچــوون و تێگەیــشتنی جیــاواز و شـیکردنەوەی نـوێ هاتـە ئـاراوە، ئـەوەی دواتـریش لـە سـەردەمی دەسـەڵاتی عوسمانییـەکان، سـوڵتانەکان ویـستیان لەسـەری هەبوایـە پێویـست بـوو بۆیـان دەسـتەبەر (مەیـسەر) بکرێـت و بەشـێکی زۆر لـە زانایان و کەسـانی شـارەزای ئیـسلام، وەك ئـەوەی سـوڵتان دەیویـست شــرۆڤەیان دەکــرد و ئەوانەشــی کــار و چــالاکییەکانیان دەکــرد بــۆ

چاوەڕوانی ئەو سەردەم و بارودۆخە زۆر کەم بوون. ئەگەر زیادەڕۆیی نەبێت، بەشێك لە زانا و کاربەدەستانی ئایین رۆڵیان لە بەلاڕێدابردنی کۆمەڵگەدا هەبوو، وەك دۆگمابوون، ئیفلیجبوونی بیرکردنەوە، داخراوی، گوێنەدانو هەڵهاتن لە دونیای دەرەوە.

لەمەوە ئایین ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتیو ژیاریو سیاسییەکانی بزر کرد و شێوەیەکی لە دابونەریت وەرگرت، هەر لەم قۆناغەدا هەژموونی رۆژئاوا لە رووی رۆشنبیری و بیری نوێوە، دەرکەوت، ئەمە هەلێکی لەبار بوو بۆ ئەوان کە بۆشاییەکان بقۆزنەوە بۆ هاتنە نێو جیهانی ئیسلام و ئامانجی خۆیان بەدەستبهێنن، ئەمەش زیاتر بارودۆخ و رەوشەکەی شێواند.[٦]

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی لاوازیی جیهانی ئیسلامی، نەبوونی یەکدەنگی و یەکڕیزی لایەنو دەسەڵاتە ئیسلامییەکان بوو. {مەبەست لە خەلیفە و سوڵتانەکانە، بەتایبەت لە سەردەمی شەڕی بەناو خاچدروشمان} کە ناکۆکییان لەگەڵ یەکتر هەبوو، یاخود لە زۆر شوێن هاوکاریو دەستتێکەڵکردنیان لەگەڵ خاچدروشمەکاندا هەبوو، ئەمە تا ئەو راددەی دەسەڵاتی خۆیان بەوپەڕی زەلیلی و لاوازییەوە رادەستی دەسەڵاتدارانی ئەوکاتی ئەوروپا کرد. ئەمەش پەیوەندی بە نەبوونی عەقڵیەتی دوورمەودای موسڵمانەکانەوە هەبوو، چونکە ئەوکات عەرەبە بەربەر و ئەمازیغییەکان زیاتر دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو.[٧] نەیاندەزانی مامەڵەیەکی تەندروست بکەن و دۆخەکەیان بەرەو خراپتر دەبرد، وەك ئەوەی ئێستا لەنێو وڵاتە ئیسلامییەکان هەیە.

هەرچی عوسمانییەکانە، تووشی هەمان گرفتو داڕووخان بوونو رکوکینە، ستەم و چەوساندنەوەی خەڵکی لەلایەن سوڵتانەکانەوە پەیدابوون، لەلایەکی دیکەوە، نەبوونی پەروەردە و فێرکردن، بوونی گەندەڵی و ساختە و فرِوفێڵی سەرکردەکان و سستی و ناهۆشیاری خەڵك، دەوڵەتی عوسمانیان بەرەو داڕووخان برد.[٨]

هەروەها، یەکێك لەو رۆڵە خراپانەی لەو سەردەم دەبینرا لەلایەن پیاوانی ئایینی و زانا و مەلاکانەوە بوو، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێدرا، جگە لەوەی وەك قەڵغانی پاراستنی سوڵتانەکان بوون، ئالۆزییەکانیان بە شەرعیی دەکرد و بە ویستی ئەوان زۆر لێدوانی ئایینیان دەدا، لە وتار (خوتبە)کانی رۆژانی هەیینی دۆعا بۆ سوڵتانەکان دەکرا و بە نوێنەری خوایان دادەنان، کە دەبوایە کەس لە دژیان نەوەستێتەوە و لە فرمانیان دەرنەچن، لەمەوە خەڵکی بە ناچاری تەسلیمی دەسەڵاتیان بوون. بەتایبەتی لە سەردەمی لاوازبوونی دەوڵەتی عوسمانیو هەژموونی ئەوروپا لە رێگەی داگیرکاری (کۆلۆنیالێ)ەوە[٩]، بەجۆرێك پووکانەوەی لایەنی کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، ئایینی و لایەنەکانی دیکەش سەریهەڵدا، ئەو کاتەی ئەوروپییەکان بە توانایەکی سەرسوڕهێنەر و فەلسەفەیەکی نوێ و زانستی جیاوازەوە بناغەیەکی نوێیان دامەزراند کە وەرچەخانێکی گەورەی لێکەوتەوە لەجیهاندا و زاناو رۆشنبیرانی ئیسلامییش هەر لە دۆخی سەدەکانی سیازدەیەم و چواردەیەمدا مانەوە[١٠]و نەیانتوانی گەشە بەو بارودۆخە بدەن.

هـــەروەها رەتكردنـــەوەی داهێنـــان و بەرهەمـــەكانی ئـــەوروپا، بەشێوەیەك زۆرێك لەو داهێنان و تەكنەلۆژیایانەی لە ئەوروپاوە دەهات رەتیانـدەكردەوە و بـە حـەرام ناویـان دەبـردن، بـەجۆرێك گوێیـان بـە زانستی نویٚ نەدەدا و بە هەمان عەقڵیـەتی پێشوو كاریـان دەكـرد كـە وەریانگرتبوو، ئەوروپایان بە كافر و شەیتان دەناساند، بەبێئەوەی بـیر لە كاتو شوێنو سەردەم بكەنەوە.

بۆیە ئەمە دۆخی پەروەردە و فێركردنیشی لاوازكرد، چونكە بەشێكی گـرنگ بـوون لــە بــەڕێوەبردنی ئــەوكات و قــسەڕۆشتوو بــوون لــەلای بەرپرسان، ئەمە زیاتر هەژموونی ئەوروپای بەرەو لوتكە دەبرد.[١١] وەك ڕێگرتنی لە هێنانی چاپخانە و دەركردنی رۆژنامە، كـە بـە كـاری كـافرو بێدینانیان لەقەڵەم دەدا، بەڵام دواتر بە ناچاری قبـوڵكرا. لەهەمانكاتـدا ئەوەی سوڵتانەكان لە خەڵكیان حەرام دەكـرد بـۆ خۆیـان حـەڵاڵ بـوو، ســوودیان لەبەرهــەم و دروســتكراوەكانی ئــەوروپا دەبینــی و منــداڵ و نەوەكانیان لە ئەوروپا دەیانخوێند، یـاخود مامۆسـتای ئـەوروپییان بـۆ دەگرتنو فێری هونەرو میوزیكی ئەوروپایان دەكردن.

ژیانی سوڵتانە عوسمانییەكان هاوچەشـنی پاشـاكانی ئـەوروپا بـوو، وەكو ئەوروپییەكان حەزیان بە ژیانی تەرفیهی بوو، هەروەها هونەرمەند و كەسی ئەوروپیان دەهێنا بۆ كۆبوونەوەو كاتی ئاهەنگو خۆشییەكانی خۆیانو بەشـدارییان پێـدەكردن، هـەروەها منـداڵ و كەسـە نزیكـەكانی خۆیان لە قوتابخانـە و شـوێنی تایبـەت دەیانخوێنـد و فێـری مۆسـیقای رۆژئاوایی دەبوون.[١٢]

یەکیکی دیکە لەو لایەنانەی کە ئەوروپا بۆ تێکشکانی دەوڵەتی عوسمانی بەکاریدەهێنا لە رێگەی شانۆگەرییەوە بوو، دەستدەکرا بە وەرگێرانی دەقە شانۆییەکانی (شیللەر، ڤیکتۆر هۆگۆ و مۆلیر) ئەو شانۆگەرییانە سەرەتا لەلایەن گرووپو تیمی ئەرمەنییەکانەوە نمایش دەکرا، دواتر کەسی موسڵمان ئەم رۆڵانەی دەبینی کە زیاتر باسیان لە سەرکەوتنو ئیجابیاتی شارستانییەتی رۆژئاوا دەکرد و ستایشی ئەو جۆرە ژیانەی ئەوانیان دەکرد، هەروەها بەشێکیان گاڵتەجارییان بە دابونەریتی کۆنی رۆژهەڵاتی دەکرد.(١٣).

جگە لە عوسمانییەکان، دەسەڵاتەکانی دیکەی ئیسلام، لە بارودۆخێکی خراپدابوون، وەك: مەغۆلو سەفەوییەکان، دواتریش دەسەڵاتە جیاوازەکانی ئێران.

مەغۆلەکان، لە شارستانیەتو کەلتووری ئەوروپا ئاگادار نەبوون، بەشێوەی گاڵتەجاڕی لە دەسەڵاتو بیرە جیاوازەکانی دەرەوەی خۆیان دەڕوانی، بیریان لەوە نەدەکردەوە ئەوروپا، چ تەوژمو رووداوێکی پێشکەوتنو رێنیسانسی تێدا روویداوە، چ کرانەوەیەکی بەخۆوە بینیوە؟ بەپێچەوانەی ئەمەوە بە چاوێکی سووكو گومانـاوی سەیری گەڕیدە و توێژەرو پزیشکی رۆژئاواییان دەکرد کە سەردانی ناوچەکانی رۆژهەڵاتیان دەکرد.(١٤)

دەوڵەتی دووەمیش کە سەفەوییەکانە، ئەوەندەی بە مەسەلەی شیعەگەریو مەزهەبو شتی ناوچەییەوە خەریکبوون، نیو هێندە سەرقاڵی کێشەکانی گەلو وڵات نەدەبوون، لەلایەکی دیکەوە شەڕێکی

دوورو درێژیان لەگـەڵ عوسمانییـەکان دەسـتپێکردبوو کـە هـەردوو لای بەرەو لێژبوونەوە دەبرد.[١٥]

لەبەرانبـەر ئـەو پەرتـەوازەیی‌و ناکۆکییـەی نێـوان موسـڵمانان، سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە)[١٦]، لە رێگەی ئەم سیاسەتەوە کێشەکانیان یەکلایی دەکردەوە، کە لە ٢٠٠ ساڵی ڕابردوودا کاریان لەسـەر کـردووەو ئامانجی خۆیان وەدەستخستووە.[١٧] بەو پێیەی ئەم سیاسەتە لەلایـەن دەوڵەتانی رۆژئاوا، بەتایبەت بەریتانیا و دواتر ئەمریکا، بـەکاردەهێنرا، بۆ وڵاتان‌و ئیمپراتۆر و دەسەڵاتەکانی رۆژهەڵات کـە تیایـدا دووبـەرەکی دەخرایە نێوانیان و ئەوانیش سیاسەت و کاری خۆیان دەکرد.

لایەنێکی دیکە کە زیاتر دەسەڵاتی عوسمانییەکانی بەرەو داڕووخـان بـرد، گوێنـەدان بـوو بـە مـافی نەتـەوەکانی دیکـە و بێبـاکی لـە کاریگەرییەکانی شۆڕش و بزووتنەوە گەورەکانی جیهان، وەك شۆڕشـی ئـەمریکا ١٧٧٤ و شۆڕشـی فەڕەنـسا ١٧٨٩ لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی نۆزدەیەم، گەلانی ئەوکات زیاتر لە ژێـر کاریگـەری شۆڕشـی فەرەنـسی بوون، ستەم‌و زۆرداری هەندێك لـە عوسمانییـەکان‌و هـەوڵی دەوڵـەتانی هاوپەیمان بۆ لێکترازان و لێکدابڕان، توانیان نەتـەوەکانی دیکـە بخەنـە سـەنگەر و بیانکەنـە دوژمنـی عوسمانییـەکان‌و هەسـتی نەتەوایـەتییان گەشەی سەند، تاکو وەرگرتنەوەی نیشتمانیان لە دەوڵەتی عوسمـانی‌و بوونە چەندین هۆز و میرنشین‌و نیشتمانی جیاواز.[١٨]

{ دیارە لێرەدا دژی مـافی گـەلانی ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی نـین، بەپێــچەوانەوە، وەك هـــەقێکی رەوای خۆیـــان دەبینرێـــت، بـــەڵام

نیگەرانییەکان روو لە دەوڵەتی عوسمانیو دەسـەڵاتەکانی دیکەیـە، کـە دەتوانرا مافەکانیان بۆ بگەڕێننەوە و نەهێڵرێت ئەوروپییـەکان کێشەی نێوخۆییان بۆ دوست بکات }

ئەو ڕاپەڕینو هەستی نەتەواییەتیەی کە وڵاتانی عەرەبی لێ بەرهـەم هـات، گـەلانی دیکـەش بـۆ دروسـتبوونی قـەوارە و وڵاتـی نەتـەوەیی راپـەڕین. وەك: محەممـەد عـەلی لـە میـسر، دواتـر مـستەفا کـەمال لـە تورکیا، رەزا شا لەئێران، کوردەکان لە چەندین جووڵانەوە و راپەڕیندا، هەروەها بە چەندین چالاکی دیکە راپەڕین، وەك: دەرکردنـی رۆژنامـە و گۆڤـار و هێنـانی چـەپەمەنی بـۆ کوردسـتان کـە سـەرجەم هۆکارەکـان هۆشیاری خەڵکی لێدەکەوتەوە.

## هەژموونی رۆژئـاوا و پرۆسەی داگیرکاری ئەوروپا بۆ جیهانی ئیسلامی

کـۆنترۆڵکردنی میـسر یەکـەم بەریەککـەوتنی جیهـانی ئیـسلامی بـوو بەرانبــەر بــە کۆلۆنیــاڵو مــۆدێرنێتی، ئەمــەش گــران بــوو بتوانرێــت هەڵـسوکەوتی لەگـەڵ بکرێـت. داگیرکردنــی میــسر لەلایــەن نــاپلیۆن پۆناپـــارت (١٧٩٨ – ١٨٠٠)، کــــۆنترۆڵکردنی هندســـتان لەلایـــەن مەغۆلەکانــەوە، شکـستی ئێـران بەرانبــەر رووسـیا (١٨٠٤ – ١٨١٣) و (١٨٢٤ – ١٨٢٨)، کــۆنترۆڵکردنی هندســـتان لەلایــەن بــەریتانیاوە، هـــەروەها شکـــستی عوسمانییـــەکان بەرانبـــەر رووســـیا و وڵاتـــە

ئەوروپییـــەكانی دیكـــە مەترســـی بـــۆ دەســـەڵاتە ئیـــسلامییەكان دروستكرد.[١٩]

ئەمانــە ڕێگــری بــۆ موســڵمانان دروســتكرد، چ لەلایــەنی رۆحــیو مەعنەوییــەوە، چ لەلایــەنی زانــستو تەكنــەلۆژیاوە، بۆیــە پێویــستبوو لەســەر دەســەڵاتە ئیــسلامییەكان بــەر بــەو تەوژمــەی رۆژئــاوا بگــرن، خاوەنی پرۆژەی تایبەت بن بۆ چاكسازی تاكو بەتــەواوی نەكەونــە ژێــر هەژموونی رۆژئاوا، هەرچەند دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی چاكسازیی دا و تا رادەیەك باش بوو، بەڵام كێشەكان قوڵتربوونــەوە و چەقبەســتوویی زیاتر جیهــانی ئیــسلامیی گرتــەوە، كێشەكانیان زۆر لــەو چــەند هەوڵــە ریفۆرمە زیاتر بــوو كــە كاریــان دەكــرد، یــاخود هەوڵــە كەموكورتــەكانی دەوڵەتیش ئەنجامی ئەوتۆی نەبوو.

## شكستهێنانی هەوڵی چاكسازی لە دەوڵەتی عوسمانی

یەكەم ریفۆرمی ئایینی ئیسلام، لە سەدەی نۆزدەیەم لــە ســەردەمی عوسمانییــەكان كــرا، لەلایــەنی پــەروەردە، ســەربازی، ئــابووری، بەڕێوەبردنو چەند لایەنێكی دیكە، كــە یەكــەم ریفــۆرمی ئیــسلامی بــوو گرنگی بەلایەنی مافی ئایینیو یەكسانیی دا.[٢٠]

لە كــاتی دەســتپێكردنی شــەپۆلی داگیركــاریو كۆلۆنیالــدا، دەوڵــەتی عوسمــانی چاكــسازییەكانی دەســتپێكرد، ئــەویش لــە "ســەردەمی تەنزیمات".[٢١] كە لەسەدەی نۆزدەیەمی زایینی بــوو، تــوانی جوڵەیــەك بخاتــە دەوڵەتــەوە، بــەڵام ئــەو رێكخــستنەوە و چاكسازییانە نــەیتوانی

ڕادەیەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆر دابنێت کە لەبەردەم چاوتێبڕینی ئەوروپادا بوو، هەروەها دیارکەوتنی جوڵانەوە نەتەوەییەکانو دووبەرەکی نێوخۆی، دەوڵەتی لە کێشەیەکەوە بۆ کیشەیەکی دیکە دەبرد.[٢٢] بەڵام ئەوەی لە سەرەتای ریفۆرمەوە زیاتر عوسمانییەکان هەوڵیان بۆ دەدا کردنەوەی سەربازگەی پەروەردەیی بوو، نەك لایەنەکانی دیکە و دەستکردن بە ریفۆرمی ئایینی، هەروەك کردنەوەی یەکەم خوێندنگەی سەربازی دەریایی بەناوی (خوێندنگەی ئەندازیاری دەریایی ١٧٧٣ ز)، ( ئەندازیاری سەربازی ١٧٩٣ ز) و (زانستی سەربازی ١٨٣٤ ز)، هەروەها یەکەم خوێندکاری ئێرانی (عەباس میرزا قاجار) کردیەوە، لە میسریش محەممەد عەلی پاشا، یەکەم هەوڵی چاکسازی سەربازییدا .[٢٣]

ئەوەی کە لە رووی سەربازییەوە کرا، بەس نەبوو بۆ ئەنجامدانی چاکسازیو توانای بەرەنگاربوونەوەی ئەوروپا، بەوپێیەی تەنیا چاکسازی، یاخود هەوڵدانی سەربازیی کێشەکانی چارەسەر نەدەکرد، لەکاتێکدا لایەنەکانی دیکەی ژیان فەرامۆشکرابوون، وەك: لایەنی پەروەردە، ئابووری، کۆمەڵایەتی و زانستی، یاخود هەوڵەکانیان وەك پێویست نەبوو.

بەهۆی فراوانی دەسەڵاتی کۆلۆنیالەکانو هەژموونیان چەند جۆرە چاکسازیو بیرکردنەوەیەکی جیاواز سەریهەڵدا، بەڵام دەسەڵاتی ئەوکاتی ئیسلامی، چ لەئێران، یاخود لای عوسمانییەکان نیگەران بوون لێیان، ئەمانیش سێ جۆر بوون، وەك ئەوانەی داوای ئازادی بیروڕایان

دەکرد و لە ژێر کاریگەری هەژموونی ئەوروپادا بوون، وەك (میرزا مالکوم خان)ی ئێرانی، ئەمانە بە یەکەم گرووپ دادەنرێن.

دووەم دەنگو گرووپی ریفۆرمخواز، لەلایەن چینی پیاوانی ئایینیو مەلاکانەوە بوو، کە زیاتر لە شێوەیەك وەڵامدانەوەو ناپەروەردەییدا بوو بۆ ئەوروپا و نەیانتوانی هەنگاوێکی بەرەوپێش بنێن، بۆیە ئەمانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو تاکو جێدەستیان دیاربێت.

گرووپی سێیەم، یاخود دەنگی چاکسازی سێیەم، لەلایەن ریفۆرمخوازە ئیسلامییەکانەوە بوو، وەك سەید جەمالەددین ئەسەدئابادی (جەمالەددین ئەفغانی ١٨٣٨ – ١٨٩٧)[٢٤] و شێخ محەممەد عەبدە[٢٥] (١٨٤٩ – ١٩٠٥)[٢٦].

ئەوان بەدەنگی ریفۆرمی ئایینی دادەنرێن، جەمالەددین داگیرکاری ئەوروپیەکانی بە هەڕەشەیەکی گەورە دەزانی بۆ سەر موسڵمانان، بۆ ئەمەش داوای چاکسازی ئایینی کرد، وەك یەکەم رێگای دەربازبوونی ئیسلام لەو سەدەمەدا.

هەروەها داوای پەروەردە و کاری زانستی دەکرد، دژی سستی و نەخوێندەواری و نەزانی بوو، بەردەوام جەختی لەسەر ئەم لایەنانە دەکردەوە، ئەوەی بە هەڵە دەزانی موسڵمان دژی زانست بێت، بەپێچەوانەوە ئیسلامی بە نزیکترین هاوڕێی زانست دەزانی.[٢٧]

هەرچی (محەممەد عەبدە)یە کە وەك قوتابی ئەفغانی خۆی دەناساند، لەهەموو شتێك زیاتر کاری بۆ هاندانی یەکێتی موسڵمانان دەکرد و بەپێویستی دەزانی. بەتایبەت لەلایەنی ئابووری، رۆشنبیری،

کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە.[٢٨] بەڵام ئەوەی ئەفغانی و عەبدە و کەسانی نزیك لە بیرکردنەوە هەوڵیان بۆ دەدا و پێشنیاری چاکسازییان دەکرد، کاریان پێنەدەکرد و سەرینەگرت، بەو پێیەی مەترسی بۆ کورسی دەسەڵاتی عوسمانییەکان هەبوو، بۆیە شتێکی ئەوتۆی لێ بەرهەم نەهات، ئیتر لەهەمانکاتدا و لە سەدەکانی نۆزدەیەم و بیست، سەردەمی کۆتاییهاتنی جوڵەی ئایینی و ئەدەب و رۆشنبیری و هونەری ئیسلام بوو کە زۆربەی شتەکان بەرەو ئیفلیجبوونی هزری و وەنەوز و بێئاگایی دەڕۆشتن.[٢٩]

ئەو وڵاتانەی رۆژهەڵات کە زۆربەیان خاوەنی پێکهاتەیەکی فرەنەتەوەیی بوون، وەك: ئێران و تورکیا، لەگەڵ ئەوەی لە ژێر گوشاری رۆژئاوادا بوون، لەهەمانکاتدا لە ناوخۆشدا لەگەڵ نەتەوەکانی نێوخۆیان، کێشەیان هەبوو، تا ئەو جێگەی توانیان دەستیان بە کوشت و کوشتار کرد، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانی نێوخۆیی، کردنەوەی دوو بەرەی نێوخۆییو دەرەکی ئەوانی زۆر لاواز کردبوو، هەروەك باسکرا، رۆژهەڵات چەقی بەستبوو، دیارە کەلتووری بەهێز هەمیشە زاڵ دەبێت بەسەر کەلتووری لاوازدا، رۆژهەڵاتیش نەیدەتوانی خۆی رابگرێت لە بەردەم بەرهەمە زانستییەکانی رۆژئاوادا کە هۆکارێك بوون بۆ ژیانێکی ئاسوودەتر و رفاهیەتی زیاتر.

## رۆژهەڵات لە پێویستی "رۆژئاواناسی"[30] دا

کردنەوەی لقێك لە زانکۆ و پەیمانگاکانی وڵاتانیو عەرەبی ئیسلامیو رۆژهەڵات، کارکردن بۆ زانستی رۆژئاواناسی بە کارێکی گرنگ لای رۆشنبیر و بیرمەندانی رۆژهەڵات دادەنرێت، بۆ ئەوەی بتوانرێت بەسەر رۆژهەڵاتناسی سەرکەونو لەبارەی رۆژئاواوە ئاشنایەتی پەیدابکەنو فێربن. بەوپێیەی زانستی رۆژهەڵاتناسی خزمەتێکی گەورەی بە جیهانی رۆژئاوا و ئەوروپا کرد، لەهەمانکاتدا خزمەتی بە رۆژهەڵاتیش کردووە، بەتایبەت ئەو بەشەی رۆژهەڵاتناسان کە کاری زانستی و ئەکادیمیان دەکرد.

خزمەتی رۆژهەڵاتناسی، بۆ رۆژئاواییەکان لەوەدا بوو بە باشی بە رۆژهەڵات ئاشنای کردنو توانیان لە رێگەیەوە دەست بۆ بەشە شاراوەکانی رۆژهەڵات ببەن، لەهەمانکاتدا هەندێکیان رێگەخۆشکەری کۆلۆنیالەکان بوون بۆ کۆنترۆڵکردنی رۆژهەڵات.

بەهەمان شێوەی ئەو زانستە، هەندێك لە بیرمەندانو نووسەرانی رۆژهەڵات، بەگرنگییەوە باس لە دامەزراندنی بەشێك بەناوی "رۆژئاواناسی" دەکەن، بەو پێیەی لە رێگەی ئەم زانستەوە لە رۆژئاوا تێبگەن.

## رۆژئـاواناسی وەك دەروازەی كرانەوە بە رووی رۆژئـاوادا

رۆژئاواناسـی بـەو زانـستە دادەنرێـت كـە لـە ڕێگەیـەوە دەتوانرێـت گرێكوێرەكانی رۆژهەڵات بەرانبەر رۆژئاوا بكاتەوە، تاكی رۆژهـەڵاتی لـە تـاكێكی پاسـیڤ و سـست و ئـیش لەسـەركراو، بگۆڕدرێـت بـۆ تـاكێكی ئیـشكەر و ئـەكتیڤ. مەبەسـت لەكرانـەوە بـەرووی ئـەوروپا و رۆژئـاوا لەلایەنی بازرگانی و سیاسی و لایەنەكانی دیكەوە نییە، بەڵكو مەبەست كرانەوەیە لە رووی مەعریفی و زانستییەوە كە تائێستا نـەتوانراوە وەك خۆی هەقی پێبدەن، باشترین شوێن بۆ دەستكردن بەم زانـستە زانكـۆو پەیمانگاكانن.

وەك چۆن بیرمەندی فەلەستینی ئیدوارد سەعید، لەسـەرەتای سـاڵی هەشتاكانی سـەدەی ڕابـردوو داوایكـرد، پـەیمانگا و بەشـی تایبـەت لـە زانكۆ عەرەبییەكان بكرێتەوە بۆ لێكۆڵینـەوە لـە رۆژئـاوا، ئەمـەش وەك سەرەتایەك دادەنرێت، وەك زانستی نوێ و سەرەتایەك بـۆ لێكۆڵینـەوە لە رۆژئاواناسی.(٣١)

هەروەها دەرچوون لە گرێی خۆبەكـەمزانینی رۆژهـەڵات، بەتایبـەت جیهانی ئیسلامی بەرانبەر بە رۆژئاوا، پێویستی بـە خـود خوێندنـەوە و بەرانبەر خوێندنەوەیە، هەریەك لەمانە تێكۆشانو ماندووبوونی دەوێت، بەتایەت كاری دووەمیان كە بەرانبەر خوێندنەوەیە، ئەویش لـە رێگـەی رۆژئاواناسییەوە، رەنگە ئەو نووسینەی نووسەر و رووناكبیری ئیسلامی حەسەن حەنەفی، باشترین نووسینی سەرەتایی بێـت لـەم بـارەوە، كـە لەسەر زانستی رۆژئاواناسیە.

حەنەفی پێیوایە، یەکێك لە ئامانجەکانی رۆژئاواناسی، بریتیە لە گرێی دەروونی خۆبەکەمزانین بەرانبەر رۆژئاوا، کە بەردەوام رۆژهەڵاتییەکان خۆیان بەکەم دەزانن و توانای رووبەرووبوونەوەیان نییە، هەروەها رۆژئاواییەکان و ئەوروپا خۆیان بە مرۆڤی سەروو، خودێکی مەزن، رۆژهەڵاتیش وەك ئەو کە ئەوێکی لاواز و ژێردەست دادەنێن، بۆیە لەرێگەی ئەم زانستە و بەدەستهێنانی زانیاری و گەڕان بەدوای نەزانراوەکانی ئەوروپا دەتوانن کۆتایی بە بەشێکی ئەو جۆرە رەفتار و مامەڵەیە بهێنن‌و بالانس رابگرن، کە لە خودێکی ئیش لەسەرکراو لێکۆڵراو بگۆڕێت بۆ خودێکی ئیش لەسەر ئەوی دیکەکەر و لێکۆڵەر.(٣٢)

ئەوەی حەنەفی باسی دەکات ڕاستییەکی تاڵە بۆ رۆژهەڵاتییەکان کە نەیانتوانیوە لە رۆژئاوا تێبگەن و ترسیان لێی هەیە، وەك چۆن هەندێك لە رۆژئاوا و ئەوروپا هەڵدێن، هەندێکی دیکە بەرەو ڕووی دەچن. هەڵهاتن لە رۆژئاوا و ئەوروپا پەیوەندی بە ترس‌و خۆبەکەمزانینەوەیە، بەتایبەت لای تاکی موسڵمان کە لە ئێستادا ناتوانن لەو فەلسەفەی رۆژئاوا تێبگەن و رەفتاری لەگەڵ بکەن.

هەرچی بەرەو روو چوون‌و عەشقی رۆژئاوا، لەلایەن خەڵکی رۆژهەڵاتەوە، رەنگە بەشێکی پەیوەندی بەو سادەیی‌و جارێکی دیکە خۆبەکەمزانینەی خەڵکانی رۆژهەڵاتەوە بێت، کە چۆن لەبەردەم رۆژئاواییەکان خۆیان بچووك دەکەنەوە، وەك ئەوەی لە کاتی پرۆسەی ئازادی عێراق و دواتر، لەلایەن کوردەکانەوە دەبینرا کە چۆن

ئەمریکییەکانیان گوڵباران دەکرد و میواننداری و خوانیان بۆ دەڕازاندنەوە.(٣٣)

هەروەها ڕۆژئاواناسی، کە پێویستە کاری لەسەر بکرێتو ببێتە پرۆژەیەکی گەورەی ڕۆژهەڵات، بەو پێیەی تا ئەو شوێنە بە گرنگ دەزانرێت، ناتوانرێت ڕۆژهەڵات لە دەستی ڕۆژئاوا و ئایدیای سەرمایەداری ڕزگار بکرێت. ئەوەش پێویستە بەرگری لە کەلتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین بکرێت، بێگومان تا "ڕۆژهەڵاتناسی" ڕۆژئاوا، تێپەڕ نەکرێت سەرکەوتن لەم ئەرکەدا بەدەستنایەت، چونکە سەرمایەداری دواپرۆژەی ئەو کەلتوورەیە.(٣٤)

هەروەها گرنگییەکی دیکەی ڕۆژئاواناسی لەوەدا دەبێت دەتوانرێت باڵادەستی ڕۆژئاوا بزانرێتو کاری زانستی بکەن، بەپێچەوانەی ڕۆژهەڵاتناسی لە سەردەمی دەرکەوتنی ئیستیعماریو داگیرکاری دەرکەوت، بەلای هەندێکەوە وەك قۆناغێکی گرنکی داگیرکاری دادەنرێت کە زیاتر ڕۆڵی سیاسی دەبینن و راسپێردراون بۆ ئیشی تایبەت و دەستەمۆکردنی گەلانی ڕۆژهەڵات، بەڵام ڕۆژئاواناسی دوای شکستی بزووتنەوەکانی وڵاتانی جیهانی سێیەم(٣٥) و گەلانی عەرەب دێت. ئامانجیشیان، گەڕان بەدوای هۆکاری باڵادەستی ئەورووپییەکان کە بووەتە مۆتەکە بەسەر گەلانی ڕۆژهەڵات، ئەمەش دەبێتە هۆشیاربوونەوە و بەخۆداچوونەوە لە ڕێی پشکنینی لایەنە جیاوازەکانی ئەورووپا و ئەمریکا.

که دەکرێت لەمەوە بگەینە ئەو باوەڕەی کە پێویستە ئەو عەقڵەو مێژووی ئەو عەقڵە بخوێنرێتەوە و ئەو گوتارانەی بەرهەمی هێناون، دواتر بوترێت ئا ئەمە ئێمەین و ئەمەمان هەیە. پێویستە لەبەردەم سیاسەتەکانی خۆرئاوا بەربەست و وەستانەوە هەبێت کە بەرژەوەندی و پیرۆزییەکانی رۆژهەڵات لەبەرچاو ناگرێت.[٣٦] بەڵام ئەمەش پێویستە ئاوڕ لە چەندین کەسی مەزن بدرێتەوە کە لە ئەورووپا شارەزان و خوێندنەوەیان هەیە، نەك بە هێز و سوپاوە، چونکە زوو ئەو قۆناغەیان بڕی، بەڵام دواتر تەسلیمیان بوون و هەموو جوانییە رۆحانی و شارستانییەکانی رۆژهەڵاتیان لێسەندنەوە.[٣٧]

کە ئەو کارانە کرا، پێویستە جارێکی دیکە پێناسی هەردوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بکرێتەوە. ئیدوارد سەعید زۆر لەسەر ئەمە کاری کردووە و هەستاوە جارێکی دیکە پێناسەی رۆژهەڵات و رۆژئاوای کردووەتەوە، هەموو ئەو وێنانەی کە رۆژهەڵاتناسەکان دروستیان کردووە سڕپویەتیەوە و وێنەی ڕاستی ڕووداوەکانی خستووەتەڕوو، بەڵام ئەوەی ئیدوارد، هەوڵی بۆ دەدا و کاری لەسەر دەکرد، بەتەنیا بەس نییە و پێویستە بەردەوام لەم لایەنەوە کار بکرێت.[٣٨]

بەو پێیەی پێویستە ناسنامە و میراتی رۆژهەڵات بناسرێتەوە کە چەند سەدەیەکە ونە، بە درێژایی ئەو چەند سەدەیەی رۆژئاواییەکان، میراتی رۆژهەڵاتیان دەبرد و لەرێگەی گەڕیدە و باڵیۆزەکانەوە کۆدەکرایەوە و لە ئەورووپا بڵاودەکراوە وەك ئەوەی کە پێویستیان بوو، بەم کارەش بەشێکی زۆر لەو پەیمانگا و دامەزراوانە هاندەری سەرەکی

بوون، ئەمە تا ئەو رادده‌یەی کـە بەشـێك لەڕاسـتییەکان شـاردرانەوە و بەرگی دیکەیان بە بەر رووداوەکاندا دەکرد، بـەڵام سـەعید، بەشـێك لـە نەبینراو و نەگوتراوەکانی خستەڕوو، زۆرێك لە شتە شاراوەکانی هێنایە ئاخـافتن کـە لـە پـشت وشـەی پڕشـنگدار و بریقـەداری زانـستگە رۆژئاواییەکان خۆی حەشاردابوو، هەر لەمەشـەوە رەخنـەی تونـدی لـە رۆژهەڵاتییەکان دەگرت.[٣٩]

هەروەها دەبێت رەفتارێکی دیکە لەگەڵ رۆژهەڵاتناسی بکرێـت و بـە چاوی زانستی لە کاری تازەیان بڕوانرێت، لەبەرئـەوەی رۆژهەڵاتناسـی، گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە بەتایبەتی لـەرووی فۆرمـەوە، چـونکە زانستە مرۆییەکانی وەك کۆمەڵناسی، مرۆڤناسی، ئەنـسرۆپۆلۆژیا رۆڵـی مـەزن و یەکلاکـەرەوەیان هەیـە لـە لێکۆڵینـەوە زانـستییەکانی رۆژهەڵات.[٤٠]

هەڵبەتە کـارکردن لەسـەر رۆژئاواناسـی پێویـستی بـە پاڵپـشتییەکی بەهێز هەیە لە رووی ماددیی و مەعنەوییەوە، ئەم کارە بەو خوێندکار و قوتابیانە بسپێردرێت کە لە وڵاتانی ئـەوروپا بـە خوێندنـەوە سـەرقاڵن، بـەجۆرێك زانـستی ئـەوروپا وەرگیرێـت و لـە ئاسـیا جێبـەجێ بکرێـت، هەروەها ناوەنـدی زانـستیی تایبـەت بـەو بـوارە بکرێتـەوە بەپاڵپـشتی دەزگای راگەیاندن، نەك خوێندکاران بڕۆنە رۆژئاوا و ئەوروپا کار لەسەر لایەنە جیاوازەکانی رۆژهەڵات بکەن.

هەروەها بەشێوەیەکی چڕتر لەلایەن ریفۆرمخوازانی موسڵمانەوە کار بکرێـت تـا لانیکـەم بتوانرێـت وەڵامـی بەشـێك لـەو پرسـیار و گومانانـە

بدرێتەوە کە لەسەر ئیسلام دروستکراون‌و تێکەڵییەك لـە نێـوان خـودی پەیامە ئایینیەکە و هێزە ئیسلامییە سیاسییەکان بکرێت.

بە بڕوای جەمالەددینی ئەفغانی، بۆ دەربازبوون لە قـەیرانی جیهـانی ئیـسلام و تێپەڕانـدنی گرێکـانی بـەردەم چاکـسازی، پێویـستی بـە پیـادەکردنی ئـاڵوویر و گـۆڕینی بنەڕەتـەکان بەرێگـەی گەشـەکردن و تـەواوکاری لـەپێناو ئامانجـە ئیـسلامییەکان‌و پتـەوبوونی بـەها مرۆڤایەتییەکان هەیە، هەروەها گـۆڕینی تێڕوانینـی دۆگمایانـەی دیـن و تێڕوانینی راست ببەخشرێت.[٤١]

بۆئەوەش ئەفغانی پێیوایـە دەبێـت بـەرەنگاری هـەژموونی ئـەورووپا بکرێـت، بـەڵام پـێش ئـەوە پێویـستە چاکـسازی قـوڵ بکرێـت کـە خۆپتەوکردن‌و بەرەنگاریی ئەوەی لە ئەورووپا هەیە و هەژموونیان روو لە رۆژهەڵات دەکات، پێویـستە چاکسازی بکرێـت، ئـەویش بـە چاکـسازی هزری‌و رۆشـنبیری لەکۆمەڵگـەدا بێتـە گـۆڕێ، دواتـر چاکسازی بـواری سیاسی‌و ئابووری، چونکە پێویستە لـە نێـو موسـڵماناندا چاکسازی لـە تێڕوانینە تەقلیدییە بەستراوەکان بکرێت.[٤٢]

هـەروەها ئـەفغانی داوای چاکـسازی پـەروەردە و کـاری زانـستیی دەکردو دژی سستی‌و نەخوێندەواری‌و نەزانی بـوو، بـەردەوام جـەختی لەسەر ئەم لایەنە دەکردەوە، ئـەوەی بـە هەڵـە دەزانـی موسـڵمان دژی زانست بێت‌و نەخوێندەواربن‌و منداڵ و نەوەکانیان نەخەنە بەر پرۆسەی خوێندن.[٤٣]

لەهەمانکاتدا پێیوابوو لەمەدا بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام، بەڵام ئایدۆلۆژی و مەبەستی تایبەت نەبێت، دەبێت پشت بە بنەما و ڕێساکانی ئیسلام ببەسترێت، نەك ئەوەی لەپێناو ئایدۆلۆژیایەك، بەرژەوەندی لایەن و تەواری جیاواز، هەروەها دەبێت هەنگاونان بەدوای وڵاتانی ئەوروپا کەم بکرێتەوە، لەهەمانکاتدا واز لە هزری کۆمەڵگە داخراو و دواکەوتووەکان بهێنرێتو هزری نوێ قبوڵ بکرێت، بەم ڕێگایانە دەتوانرێت بەگژ ئایدیا و فکرەی ڕۆژئاوادا بچێتەوە.[٤٤]

سەرەڕای ئەوەش، پێویستە قوڵبوونەوەیەك بە مێژوو و ڕووداوەکانی نەتەوەدا ئەنجام بدرێت، چونکە بەبێ ئەو قوڵبوونەوەو ئاشنابوون بە مێژووی نەتەوەدا، زەحمەتە برینەکان دەستنیشانو چارەسەر بکرێن.[٤٥] بۆیە لەسەر گەلانی ڕۆژهەڵات بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەت پێویستە بە تەواوی ئاشنای مێژوو و ڕووداو و بۆنەکانی بێت، نەك ئەوەی کە هەیە لە زاری ڕۆژئاواییەك و وڵاتانی دەوروبەر دابڕێژرێتەوە، ڕاستە ئەو نووسراوانە هاوکار دەبێت، بەڵام دەبێت وەك سەرچاوە و ماددەی خاو لەبەردەست بێت، نەك وەك ئەوەی کە هەیە جارێکی دیکە بگوازرێتەوە.

یەکێکی دیکە لەو بنەمایانەی کە پێویستە پەیڕەو بکرێت یەك گوتاری، یەك هێز و بزوێنەرێتی و چوونە ژێر چەتری یەك وتاری سەرکردایەتی.[٤٦] لێرەوە پێویستە باس لە دوو لایەنی گرنگ بکرێت کە بەردەوام گەلانی ڕۆژهەڵات و کورد بەدیارییکراوی قوربانیی بووە، ئەویش دروستکردنی ئەو لێکترازاوییەی لە نێوان نەتەوە و گەلانی

ڕۆژهەڵات لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە، ئەگەر لەپێناوی ئەوەی نەتوانن بیر لە ماف و بەرژەوەندییە سەرەکییەکان بکەنەوە و تەنیا سەرقاڵی یەکتربن، هەروەها ئەوروپییەکان لەوەدا باشی بۆ چوون کە دەڵێت: "لەبەر جیاوازی زۆر، نەبوونی یەك گوتار و یەك سەرکردایەتی، بۆیە پێویستە بەڕێوە ببرێن، ئەمەش تەنها ئەوروپیەکان دەتوانن ئەو کارە بکەن".

هەرچی (محەممەد عەبدە)یە، لە هەموو شتێك زیاتر کاری بۆ هاندانی یەکێتی موسڵمانان دەکرد و لەلایەنی ئابووری، ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە بەپێویستی دەزانی[٤٧]. ئەوەی عەبدە، سەدەیەك پێش ئێستا داوای کردووە بۆ ئەم ڕۆژگارە پێویستە، چونکە وڵاتانی ئیسلامی لە پەرتەوازەیی دووبەرەکی و ململانێ لەگەڵ یەکتر دەژین.

گەشەدانو پەرەپێدانی زمان، ئەمەش ڕۆڵی دەبێت لە یەکیەتی نەتەوەو گەلاندا، ئەمەش ڕۆڵی سەرەکی دەبێت و ئامرازێکی مەزنە بۆ نزیکبوونەوەی نەتەوە پەرتەوازەکان.[٤٨]

ململانێی جیهانی ئیسلامی لەگەڵ ڕۆژئاوا، لە شەڕەوە بگۆڕێت بۆ دیالۆگ، بەو پێیەی لەو چەند سەدە شەڕکردنەی لەگەڵیان کراوە، دەرئەنجامێکی باشی نەبوو، بۆیە دیالۆگی نێوان شارستانییەتەکانو بەتایبەت شارستانیەتی ئیسلام و ڕۆژئاوا، هەروەك هەندێك لە ریفۆڕمخوازانی ئیسلام ئاماژەی بۆ دەکەن، خاڵی سەرکەوتنی ئیسلام لە گفتوگۆدا دەبێت، نەك لە شەڕدا، لەهەمانکاتدا ڕۆژئاوا بۆچوونی

بەرانبەر ئیسلام بەشێوەی دوو هاوبەشی یەکسان بێت و واز لە لۆژیکی هێز بهێنێت.[٤٩]

کرانەوە بەرووی رۆژئاوا، بۆ رەفتارکردن لەگەڵ ئەو جیهانە جیاواز و دابونەریتی نویێ و شێوە رێرەوی تایبەت بەخۆیان، ئەمەش وەك وەرگرتنی موسڵمانە سەرەتاییەکان کە چۆن فەلسەفەی یۆنان و لایەنەکانی دیکەیان وەردەگرت. لەئێستاشدا سوودوەرگرتن لە سیستمی خوێندن و سیستمی سیاسی و ئابووری ئەوروپا هۆکارێکە بۆ برەوپێدانی وڵاتانی ئاسیا.

ئەوان بە دەنگی ریفۆرمی ئایینی دادەنرێن، جەمالەددینی ئەفغانی داگیرکاری ئەوروپیەکانی بە هەرەشەیەکی گەورە دەزانی بۆ موسڵمانان، بۆ ئەمەش داوای چاکسازی ئایینی کرد وەك یەکەم رێگای دەربازبوونی ئیسلام لەو سەدەمەدا.

پێویستە بۆ رزگاربوون لە هەژموونی ئایدۆلۆژیای رۆژئاوا، هەوڵبدرێت بۆ چارەسەری کێشەی هەر وڵاتێك بەپێی سروشت و کەلتوورو ژیار و ئامادەبوونی ئەو وڵاتانە بێت، نەك وەك ئەوەی ئەوروپیەکان دەیانەوێت چارەسەری کێشەی وڵاتانی ئاسیایی پێبکەن.[٥٠]

ئەوەی بە پێویست دەزانرێت، گەڕانەوەی رۆڵی سەرەکیی ئایینە لە رۆژهەڵات و بەتایبەتی وڵاتانی ئیسلامی، کە ناکرێت بە فەلسەفەی ئەوروپا ئەو بۆشاییە پڕبکرێتەوە، چونکە یەکێك لەو رۆڵانەی کە فەلسەفەی ئەورووپی هێناویەتیە نێو جیهانی وڵاتانی ناوینەوە، کەمکردنەوەی رۆڵی ئەخلاق و ئایینە لە چارەسەرکردنی کێشەکان بۆ

نزمترین ئاست، چونكه دەزانن داوەرییەكانی ئایینو ئـەخلاق، ئـەنجامی شیكار و چارەسـەرییەكانی پێـوەری ویـژدانیو دادپـەروەری ئەزموونـە كۆمەڵایەتییەكەی كەلتووری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.[(٥١)]

هەروەها ڕێبەرایەتی رۆژهەڵاتی و موسڵمانان لەلایەن خۆیانەوە بێت، نەك وڵاتـانی ئـەوروپا و رۆژئـاوا، ئاشـكرایە ئـەو مۆدێلـەی كـە ئـەمریكا ڕابەرایەتی دەكات شێوەی نـوێی سـەرمایەدارییە كـە تێیـدا لـە سـاڵانی پەنجاكان دامەزراندنی ناتۆ و تیایدا بەشدارییكردنی توركیا، بـۆ دابڕانـە لەو مەیلە سۆشیالیستیەی كە هـەیبووە، مەیلـداری واقیعـی ناوچـەكە و مەیلداركردنی سیستمی ئەمریكا.[(٥٢)]

بۆیە پێویستە ئەو باڵایی و هەژموونی رۆژئاوا لە رۆژهەڵات، بەتایبەت رۆژهەڵاتی ناوەڕاست كەم بكرێتەوە، بـەو پێیـەی بـاڵابوونی هـەژموونی شارستانیەتی رۆژئاوا لەنێو وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوین، زیـاتر كێـشەكانی زەق دەكردەوەو پەرەیان پێدەدا.[(٥٣)] چـونكە لـە رێگـەی دەستخـستنە رۆژهــەڵاتو جیهــانی ئیــسلامی سیاســەتی پە*رتكــەو زاڵبــە*، پــەیڕەو دەكەن[(٥٤)] هەروەك لە پێشتر باسكرا.

# ئەنجام

بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانەی رۆژهەڵاتی پێدا تێپەڕدەبێت، بەتایبەت رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی، پێویستە لەلایەن خۆیانەوە (موسڵمانان) و ئەو وڵاتانەی رۆژهەڵات، کێشەکانیان چارەسەر بکەنو بڕیاری لەسەر بدەن، نەك لەلایەن رۆژئاواوە، بەوپێیەی ئەوان ناتوانن لە واقیعی کێشەکان بگەن، وەك ئەوەی رۆژهەڵاتییەکان دەتوانن، هەروەها بەشێك لەکێشەکان رۆژئاواییەکان دروستیانکردووەو نایانەوێت کۆتاییان بێت، ئەمەش لەبەرپاراستنی بەرژەوەندییەکانیان.

پێویستە لەسەر وڵاتانی ئیسلامی یەکێتی و هەماهەنگی لەنێو خۆیاندا دروست بکەن، گیانی یەکگرتوویبان هەبێت بۆئەوەی بەشێك لە کێشەکانیان کەم بێتەوە و چارەسەری ئەو ئالۆزییانەی ناوچەکە بکەن.

کارکردن بۆ دامەزراندنی زانستی رۆژئاواناسیو کردنەوەی لق لەپەیمانگا و زانکۆکانو توێژینەوە لەسەر رۆژئاوا، بەکارێکی پێویست دادەنرێت، بەو پێیەی دەتوانرێت لەڕێگەیەوە رۆژئاوا بناسن و نەچنە ژێر باریانەوە، ئەمەش هەنگاوی جددیی دەوێت، بەو دۆخەی ئێستای ئیسلامەوە ناتوانرێت کارێکی لەو شێوە بکرێت.

چاکسازی ئایینی لە خودی ئایینی ئیسلام بە پێویستییەکی ئێستایی دادەنرێت، چونکە بێسەروبەرەیی بە گوتاری ئیسلامییەوە دیارە، جۆر و شێوازی کارکردنی گرووپە ئیسلامییەکان بارگرانی بۆ موسڵمانان و جیهان دروستکردووە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان


١. د. حەمید عەزیز: (فەلسەفەی زانستی کەلام)، هەولێر، چاپخانەی موکریانی، چاپی یەکەم، ٢٠١٢، لاپەڕە ٢٠.

٢. د. حەمید عەزیز: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٥.

٣. د. حەمید عەزیز: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٠.

٤. د. کەمال مەزهەر: (ڕێنسانس)، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە: فوئادی مەجید میسری، چاپخانەی حەمدی، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٢.

٥. ابو الحسن علي الحسني الندوي: (بە داڕووخانی موسڵمانان، جیهان چ زیانێکی لێکەوت؟!!)، وەرگێڕانی: ئارام گەلاڵی، چاپی دووەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨، لاپەڕە ٢١٩ – ٢٢٠.

٦. کامەران محەممەد: (جەمالەددینی ئەفغانی و پڕۆژەی بوژاندنەوەی ڕۆژهەڵات)، گۆڤاری هەژان، ژمارە ١٤و ١٥، ٢٠٠٤، لاپەڕە ١٦٨.

٧. (سەڵاحەددینی ئەیوبی گەورەتر لە رەخنەگرانی)، گفتوگۆ لەگەڵ پڕۆفیسۆر د. موحسین محەممەد حسێن)، ئامادەکردنی: ئارام عەلی سەعید: چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی ٢٠٠٦، لاپەڕە ٧٨.

٨. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٢٠.

٩. کۆلۆنیالی ئەوروپا: کۆلۆنیاڵ، یان داگیرکاری، دەستگرتنە بەسەر خاکی وڵات، یان هەرێمێکی دیکەدا لە فۆرم و شێوەیەکی سیاسییدا،

بەشێوەی ڕاستەوخۆ بێت، یان ناڕاستەوخۆ کە تیایدا بەشێوەی یەکسان مامەڵە ناکرێت لە نێوان داگیرکەر و داگیرکراودا.

کۆلۆنیالی ئەوروپی بۆ خاکی ئاسیاو ئەفریقا، بۆ سەرەتاکانی سەدەی ١٥ دەگەڕێتەوە، کاتێك ئەوروپییەکان، بە دوای ڕێگای بازرگانییدا گەڕان بۆ گەیشتن بە وڵاتی چین، ئەمەش دیارە سەردەمی دۆزینەوە جیۆگرافیەکان بوو لە سەدەی ١٦ کە بە سەردەمی کەشتیوانی بەناوبانگە، ئایدیاکانیان بۆ گەیشتن بە ئاسیای دوور گەشەی سەند، هەروەها فکرەی (بازاڕی ئازاد) سەریهەڵدا و لەوێوە سەرەتاکانی کۆلۆنیاڵیو داگیرکاری ئەوروپا و ڕۆژئاوا دەستی پێکرد تاکو شەڕی جیهانی دووەمو سەربەخۆیی وڵاتان بەردەوام بوو، دواین دەوڵەتی کۆلۆنیاڵ لە ساڵی ٢٠٠٢ لە پرتوگال کۆتاییهات.

سەرەتا پرتوگالی و هۆڵەندییەکان دەستیانکرد بە پرۆسەی داگیرکاری، کە هۆڵەندا کۆمپانیای (هندی ـ ڕۆژهەڵاتی)ی لە نێوان ساڵانی ١٦٤٠ـــ١٦٦٠ دامەزراند، هەروەها بەریتانیا (کۆمپانیای هندی ـ ڕۆژهەڵاتی) لە ساڵی ١٧٥٧ دامەزراند و بەتەواوی دەسەڵاتی سیاسی گرتەدەست.

لەوێوە دەستیانکرد بە بازرگانی و دواتریش ئایدیا و بەرژەوەندییەکانیان لە داگیرکاری ناڕاستەوخۆ و بازرگانییەوە گۆڕا بۆ داگیرکاری ڕاستەوخۆ و سیاسی کە دەستگرتن بەسەر وڵاتانی ئاسیا، لە وڵاتی هندستانەوە دەستیپێکرد و دەستیان بەسەر وڵاتانی دیکەی ئاسیادا گرت، بەتایبەتی بەریتانیا، فەڕەنسا و هۆڵەندا و هەندێك لە وڵاتانی دیکە، ئەمەش تاکو جەنگی جیهانیی یەکەم بەردەوام بوو، کاتێك بزووتنەوەو چالاکییە ناسیۆنالیستییەکان دەستیانپێکرد، دواتریش لە جەنگی جیهانیی دووەمەوە وردە وردە کۆتایی بە کاری کۆلۆنیالی ڕاستەوخۆ هات.

١٠. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٢١.

١١. ابو الحسن علي الحسني الندوي: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٢٤.

*12.* Shireen T. Hunter Editr: reformest voices of Islam, (mediating islam and modernity) first edition, new Delhi, india 2009, page 14-15.

١٣. پۆل دۆمۆن: (سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩–١٨٧٤)، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، ٢٤–٢٥.

١٤. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٢٦.

١٥. ابو الحسن علي الحسني الندوي: هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

١٦. سیاسەتی (پەرتکە و زاڵبە): چەمکێکی سیاسیو کۆمەڵایەتییە، ڕیشەکەی بۆ یۆنانییەکان دەگەڕێتەوە، کاتێک هێزی دابەشکاریو کۆنترۆڵکردن دێتە ئاراوە، لە ڕێگەی ئەم سیاسەتەوە دەتوانن لێکترازان لە نێوان گرووپەکان دروست بکەنو بەسەریاندا زاڵ بن، یان بەستنی هاوپەیمانیو هاوکارییکردنە لەگەڵ هێزێک دژی ئەوی دیکەیان، یاخود دوستکردنی بێمتمانەیی و سیقە لە نێوان یەکتردا.

١٧. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (نەخشەڕێگا، کێشەی دیموکراتیزەبوون لە تورکیا و مۆدیلەکانی چارەسەری لە کوردستان)، وەرگێڕانی: گۆڤاری ڕۆژی وڵات، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە ١٠٤.

١٨. ابو الحسن علي الحسني الندوي: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٣٠.

*19.* Shireen T. Hunter Editr: Op. cit, page, 13

*20.* Shireen T. Hunter Editr: Ibid, 227

٢١. سەردەمی تەنزیمات (١٨٣٩ – ١٨٧٦): سەردەمی چاکسازی دەوڵەتی عوسمانی بە سەردەمی تەنزیمات بەناوبانگە، ئەمەش وشەی تەنزیمات

لــە (تنظــیم)ەوە هــاتووە کــە بــۆ ڕێکــسختنەوەو نۆژەنکردنــەوەی دەوڵــەتی عوسمـانی بـوو. سـەرەتای چاکـسازییەکان دەگەڕێتـەوە بۆسـەردەمی سـوڵتان مستەفای سێیەم و سوڵتان سەلیمی سێیەم، کە دەستکرا بە چاکسازی لـە نێـو دەوڵەتی عوسمـانی بـۆ ڕێگـرتن لـە لاوازبـوونو داڕووخـان کـە تیایـدا چاکسازی سـەربازیو ئـایینیو پـەروەردەو سیاسـی کـرا، بـەڵام وەك پێویـست نـەبوو، لـە سـەردەمی عەبدولحەمیـدی دووەم لـە سـاڵی ١٨٧٦ کۆتـایی بـە چاکـسازییەکان هێنرا، هەروەها پێشتر کێشە لە نێوان ڕیفۆرمخوازاندا سـەریهەڵدابوو، بەوپێیـەی بەشێکی لەگەڵ مانەوەی سیستمە کۆنەکە بوون و ئەوانی دیکـە لەگـەڵ شـێوازی ڕیفۆرمی ئەوروپی بوونو سوودیان لەوان وەردەگرت.

*22.* - Shireen T. Hunter Editr Op. cit, page 12

*23.* Shireen T. Hunter Editr: Ibid, page, 14

٢٤. جەمالـــــەدین ئـــــەفغانی (١٨٣٨ – ١٨٩٧): لـــــە هـــــەرێمی (ئەسەدئاباد)ی وڵاتـی ئەفغانستان لەدایك بووە، لە ڕەگەزی (پشتۆن)ەکـانی ئەو وڵاتەیە، هەرچەندە هەندێك لـە سەرچـاوەکان ئامـاژە بـەوە دەکـەن کـە جەمالەددین خەڵکی ئێرانە و لەگوندی (ئەسەدئاباد)ی نزیك هەمەدان لـەدایك بووە، بـەڵام وەك ئەفغانییـەك ناسـێنراوەو نازناوەکـەی ئەفغانییـە، تەمـەنی منداڵی لە ئێران بەسەربردووەو سەرەتا پەروەردەو فێرکردنی لەماڵەوە بووە و دواتـر چـەندین شـوێن گـەڕاوەو چـووەتە شـارەکانی قـەزوینو تـاران بـۆ خوێندنو دواتریش بۆ عێـراق، لەگـەڵ ئـەوەی سـەر بـە مەزهـەبو ڕێـچکەی شیعە بوو، بەڵام بووەتە سوونە و کێشەی لەگەڵ دەسەڵاتی ئەوکاتی ئێـران بۆ دروستبووە.

ئەفغانی، بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی فیکرەی ڕیفۆرمی ئیسلام دادەنرێت لــە ســەدەی نۆزدەیەمـدا داوای چاکـسازی سیاسـیو کۆمەڵایـەتی ئـابووری

دەکرد، چەندین پێشنیازی لەو بارەوە کردووە، لە ساڵی ١٨٥٥ سەفەری بۆ بەریتانیا کردووەو لەوێ خوێندویەتی، لە ساڵی ١٨٥٩ بەتۆمەتی سیخوڕی بۆ رووسیا کێشەیان بۆ دروستکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا دژی ئەوە بوون جلی نەتەوەیی لەبەر بکات، ساڵی ١٨٦٥ چووەتە حەجو لە هەمان ساڵ چووەتە تاران، ساڵێك دواتریش چووەتە ئەفغانستان.

ئەفغانی، زمانەکانی فارسی، داری، تورکی، ئینگلیزی و عەرەبی زانیوەو قسەی پێکردوون، دواتر چووەتە میسر و لەوێ وانەی ئایینی وتووەتەوە ژمارەیەکی زۆر خوێندکاری هەبووە، لەوانە: محەممەد عەبدە.

دواتر گەڕاوەتەوە بۆ ئێرانو ماوەیەك زیندانیی کراوە، لەدوای ئەوەی نەفی کراوە بۆ سنووری دەوڵەتی عوسمانی، لەلایەن عەبدولحەمیدی دووەم بانگهێشتکراوە، بەڵام لە ساڵی ١٨٩٧ کۆچی دوایی کرد.

٢٥. محەممەد عەبدە (١٨٤٩– ١٩٠٥) لە باوکێکی تورکو دایکێکی عەرەب لە وڵاتی میسر لەدایك بووە، لێکۆڵەرێکی ئیسلامی مۆدێرن بوو، کاری بۆ ریفۆرمی ئاییینی دەکرد، بەڵام وەك موعتەزیلەی هاوچەرخ لەلایەن توندڕەوەکانەوە ناویان دەبرد.

عەبدە لەلای جەمالەددین ئەفعانی وانەی خوێندووەو بە خوێندکاری ئەفغانی خۆی دەناساند، عەبدە، لەسەر چەند لایەنێکی جیاوازی ئیسلام نووسینی هەبوو و قسەی دەکرد، بەڵام زیاتر گرنگی بە وەحدانیەتی خوا و لێدوانو شرۆڤەی بۆ قورئان دەکرد.

لە ساڵی ١٨٧٧ بووەتە مامۆستا و وانەی لۆژیکی وتووەتەوە، ساڵێك دواتر بووەتە مامۆستای مێژوو لە زانکۆی ئەزهەر، رۆڵی هەبوو لە

بەرەوپێشبردنی ئەو زانکۆیەدا، عەبدە، داوای یەکێتی ئیسلامی دەکردو داوای کردووە منداڵان بخرێنە بەر خوێندن، تاکو لەو ڕێگەیەوە پێشبکەون.

26. Shireen T. Hunter Editr: Op. cit, page, 14.
27. Shireen T. Hunter Editr: Ibid. page, 15.
28. Shireen T. Hunter Editr: Ibid, page, 15.

٢٩. کامەران محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٢٤.

٣٠. (ڕۆژئاواناسی)، بریتیە لە زانستی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لە ڕۆژئاوا، لەلایەن ڕۆژهەڵاتییەکانەوە لە بەرانبەر زانستی ڕۆژهەڵاتناسی بەکاردەهێنرێت، مێژووی بەکارهێنانی ئەم چەمکە بۆ سەدەی هەژدەیەمو نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە.

٣١. حەبیب محەممەد دەروێش: (کورد و پێویستی زانستی ڕۆژئاواناسی)، گۆڤاری کۆچ ژمارە ١١و ١٢، ساڵی ٢٠٠٩، لاپەڕە ١١٨.

٣٢. حەبیب محەممەد دەروێش: هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٣٣. ئیسماعیل حەمە ئەمین، (نەوەکان و گەڕەلاوژەکانیان)، (کۆمەڵەوتار) چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، لاپەڕە ١٢.

٣٤. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (قەیرانی شارستانی لە خۆرهەڵاتی ناوینو چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی)، وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا، کتێبی چوارەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠١١، لاپەڕە ١٦.

٣٥. وڵاتانی جیهانی سێیەم: چەمکێکی سیاسی، ئابووری کۆلۆنیالیەتییە، لە سەردەمی شەڕی سارد بەکارهێنرا بۆ ئەو وڵاتانەی نەچوونە پاڵ هیچ کام لە دوو بلۆکەکەوە (ڕۆژئاوا و سۆڤیەت) و بەبێلایەنانە مانەوە، هەروەها ئەم وڵاتانە لە رووی ئابووریەوە هەژار بوونو گەشەی ئابووریو دەوڵەتی پیشەسازیی نەبوون، کە بە وڵاتانی سێیەم ناسێنران، بەڵام لەئێستادا ئەو چەمکە هەم لەلایەنی

ئابووری‌و هەم لەلایەنی سیاسییەوە بەکارناهێنرێت، بەو پێیەی هەندێك وڵات لە رووی ئابوورییەوە گەشەیان سەندووە، وەك: بەرازیل و هندستان، هەروەها هەندێك وڵاتیش بوونەتە دۆستی رۆژئاوا، وەك: میسر.

٣٦. فاروق رەفیق: خەمە جڤاتیەکان، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە ٣١٦ و ٣١٧.

٣٧. فاروق رەفیق: خەمە جڤاتیەکان، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٣١٧.

٣٨. ئیسماعیل حەمە ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١١.

٣٩. ئیسماعیل حەمە ئەمین: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٤.

٤٠. ئیسماعیل حەمە ئەمین: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٤

٤١. حەبیب محەممەد دەروێش: گۆڤاری کۆچ، ژمارە ١١ و ١٢، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١١٨.

٤٢. کامەران محەممەد: گۆڤاری هەژان، ژمارە ١٤و ١٥، لاپەڕە ١٧٥.

٤٣. کامەران محەممەد: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٧٥.

*44.* Shireen T. Hunter Editr: Op. cit, page, 15.

*45.* Shireen T. Hunter Editr: Ibid, page, 15.

٤٦. کامەران محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧٦.

٤٧. کامەران محەممەد: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٧٩.

*48.* Shireen T. Hunter Editr: Op. cit, page, 15.

٤٩. کامەران محەممەد: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٨٦.

*50.* Shireen T. Hunter Editr: Op. cit, page, 61.

٥١. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٢.

٥٢. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٢٥.

٥٣. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٨٨.

٥٤. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٠٣و ١٠٣.

# ئه نجامی گشتی توێژینەوەکە

ـ پێویستە بە چاوێکی دوژمنکارانە سەیری ڕۆژهەڵاتناسان نەکرێت و هەموو کارەکانیان رەتنەکرێتـەوە، وەك چۆن دروست نییـە تـەنیا بـە فریادڕەس و پارێزەر دابنرێن.

ــ بـەڵکو پێویـستە بـە چـاوی زانـستیو ئـەکادیمی کارەکانیـان هەڵبـسەنگێنرێت، بەوپێیــەی هەنـدێکیان ئیـشی دانـسقە و نایابیـان کـردووەو بـە دڵـسۆزانە ڕاسـتییەکانیان گواسـتووەتەوە، لەهەمانکاتـدا هەنـدێکی دیکـە مەبەسـتو غایـەی خۆیـان بەرانبـەر گـەلانی ڕۆژهـەڵات هەبووە، بۆیە دەبێت جیاوازی لە نێوان ڕۆژهەڵاتناسان بکرێـت، چـونکە ئەوەندەی قسە لەسەر ڕۆژهەڵاتناسی دەکرێت، نەتوانراوە مـافی تـەواو بە زاراوەکە و چەمك و پێناسی بدرێت، کە تا ئێستا کێـشەکان زۆرتـر و زیـاتر دەبێـت، بەیەکـدادانی شارسـتانییەتەکانی ئـەورووپا و ئاسـیا، بـە تایبەت جیهانی ئیسلام تا بێت زیاتر دەبێت.

- رۆژهەڵاتناسی، لە پەیوەندیی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا، فۆڕم و شێوازێکی نوێی هێنایە بەرهەم، لە دونیایەکی شەڕ و پێکدادان بۆ دونیایەکی زانست و ململانێی مەعریفی گۆڕا.

- هەرچەندە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە ناوی رۆژهەڵاتناسی گۆڕاوە، بەڵام فیکرەی رۆژهەڵاتناسی تائێستا هەیە و بەردەوامە، کە هەندێکیان هۆکارێك بوون بۆ بە کەم سەیرکردنی رۆژهەڵات.

- رۆحیەتی باڵایی مرۆڤی رۆژئاوا، بەدرێژایی مێژووی هەردوو شارستانیەتەکە و بەیەکدادانیان هەبووەو بەردەوام دەبێت، ئەمەش لەئەنجامی هەندێك بۆچوونی بیرمەند و فەیلەسووفانی یۆنانی، دواتر رۆشنبیران و رۆژهەڵاتناسان دروستبووەو چووەتە نێو خەڵکیەوە.

- پێویستە لەسەر رۆژهەڵاتییەکان بەباشی خوێندنەوەیان بۆ هەردوو شارستانییەتەکە هەبێت، بۆ ئەوەی هەستی خۆبەکەمزانین و ئەوی دیکە بە گەورەزانین نەبێت، وەك ئەوەی لەم سەردەمەدا لەلایەن رۆژئاواییەکانەوە کاری لەسەر دەکرێت.

- بۆچوونی رۆژهەڵاتناسان بەرانبەر بە ئیسلام لەلایەکەوە پەیوەندی بەو کەلتووری بەریەککەوتنەوە هەیە، لە نێوان هەردوو بلۆکی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، دواتریش ململانێی هەردوو ئایینەکە، دیارە زۆرینەی رۆژهەڵاتناسانیش مەسیحینو لەژێر کاریگەری ئایینەکەیاندان،

لەگـەڵ ئـەوەی پابەنـد نـەبن پێـوەی، بۆیـە بـۆ پاراسـتن‌و مانـەوەی ئایینەکەیان هـەوڵی ناشـیرینکردنی بەرانبەرەکـەیان دەدەن کـە ئـاییـنی ئیسلامە. لەهەمانکاتدا بەشێوەی جیاواز موسڵمانانیش سـووکایەتی بـە پیرۆزییەکانی مەسیحی دەکەن.

- پێویـسـتە موسـڵمانان رێگەیـەکی دیکـە بگرنـە بـەر بـۆ رووبەڕووبونەوەی رۆژئاوا و ئەوروپا، کە دووربێت لە توندوتیژی‌و زمانی هەڕەشە، لەبەرئەوەی لـە چـەند سـەدەی رابـردوو ئـەوە دەرکـەوت بـە زمانی گفتوگۆ نەبێت ناتوانرێت خۆ لەو قەیرانـە ڕزگـار بکـەن، نـەك بـە سـووتانی بارەگـا و باڵیۆزخانـە و نوێنەرایـەتی وڵاتـانی ئـەوروپا و هێرشکردنە سەریان.

- بەڵکو لەبری ئەوانە، پێویستە لەسەر وڵاتانی ئیسلامی یـەکێتی و هەماهەنگی لەنێو خۆیان دروست بکەن‌و گیانی یەکگرتوویيان هـەبێت بۆئـەوەی بەشـێك لـە کێـشەکانیان کـەم بێتـەوە و چارەسـەری ئـەو ئاڵۆزییانـەی ناوچـەکە بکـەن. لەهەمانکاتـدا بـە مێـژوو و کـەلتووری ئیسلامییدا بچنەوەو ریفۆرمی ئایینی بکرێـت، کـە بـەجۆرێك ئـەو ترسـە بشکێنرێت کە ناتوانترێت لەبەر بەرژەوەندی سیاسی بێـت، یـاخود هـەر مەبەستێکی دیکە دەسـت بـۆ هەنـدیك لایـەن ببرێـت کـە بوونەتـە هـۆی داڕووخـانی کـەلتووری ئیـسلامی، لەهەمانکاتـدا هـەوڵی تێگەیـشتن لـە رۆژئاوا بدرێت، ئەویش لە رێگەی لێکۆڵینـەوەو بەدواداچـوون بـۆ لایەنـە جیاوازەکانی رۆژئاوا.

# سەرچاوەکان:

## ❖ سەرچاوە کوردییەکان:


١. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (قەیرانی شارستانی لە خۆرهەڵاتی ناوین‌و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی)، وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا، کتێبی چوارەم چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠١١.

٢. عەلی عیززەت بیگۆڤیچ: (ئیسلام لە نێوان رۆژهەڵات‌و رۆژئاوادا)، وەرگێڕانی: محەممەد چیا، سلێمانی، چاپی دووەم، ناوەندی رۆشنبیر، ٢٠٠٢.

٣. د. کەمال مەزهەر: (رێنسانس)، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: فوئادی مەجید میسری، چاپخانەی حەمدی، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٤. مۆنتیسکۆ: (رۆحی یاساکان)، و. ئیدریس شێخ شەرەفی، چاپی سێیەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی .

٥. فاروق رەفیق: (غەمە جڤاتیەکان)، سلێمانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی رەنج، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦.

٦. ابو الحسن علـى الحـسني النـدوي: (بـه داڕووخـانی موسـڵمانان، جیهـان چ زیـانێکی لێکـەوت؟!!)، و: ئـارام گـەڵاڵی، چـاپی دووەم، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ۲۰۰۸.

٧. عەبـدوڵڵا ئـۆج ئـالان: (مانیفـستۆی شارسـتانێتی دیموکراسـی شارستانی سەرمایەداری)، وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەکـانی کـۆنگرەی گـەلی کوردسـتان (ئامـاژە بەشـوێن و سـاڵی چاپکردنی نەکراوە).

٨. صـفي الرحمـان المبـارکفوري: (ژیننامـەی پێغەمبـەری ئیـسلام (گوڵاوی سەرمۆر))، بەکر حەمەصدیق عارف، چاپی هەشتەم، سلێمانی، ناوەندی رۆشنبیر، ۲۰۱۳.

٩. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان: (نەخشەڕێگا، کێشەی دیموکراتیزەبوون لە تورکیا و مۆدیلەکانی چارەسەری لە کوردسـتان)، وەرگێڕانـی: گۆڤـاری ڕۆژی وڵات، سلێمانی، ۲۰۱۱.

١٠. تەحسین حەمەغەریب، (ئیسلامی کـوردیو ریفـۆرمی ئـایینی)، سلێمانی، بڵاوکراوەکانی خانە و چاپی هەژان، ۲۰۱۳.

١١. د. حەمیـد عـەزیز: (فەلـسەفەی زانـستی کـەلام)، هـەولێر، چاپخانەی موکریانی، چاپی یەکەم، ۲۰۱۲.

١٢. (گەشـتەکەی زینۆفـۆن)، و. محەممـەد مەسـعود محەممـەد جەلیزادە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ۲۰۰٦.

١٣. ئیـسماعیل حەمەئـەمین، (نـەوەکانو گـەڕەلاوژەکانیان)، (کۆمەڵەوتار) چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی.

١٤. سەلام عەبدولکەریم: (موقەددەسو کەلتوور (ئیشکالیەتی بەریەککەوتنی نێوان ئیسلام و خۆرئاوا))، چاپی یەکەم، چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٧.

١٥. پۆل دۆمۆن: (سەردەمی تەنزیمات، ١٨٣٩ــ١٨٧٤)، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

١٦. ئافراسیاب گرامی: (ئاخێوی (گفتمان Discourse) زاراوە، رەوڕەوەی مێژوویی)، (هیچ ئاماژەیەك بۆ شوێنو ساڵی چاپکردنی نەکراوە).

١٧. (سەڵاحەددینی ئەیوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی)، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین محەممەد حسێن، ئا: ئارام عەلی سەعید، هەولێر، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦

### ❖ سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

**18.** Edward Said, Orientalism,(USA) penguin group, 2003

**19.** Zachary Lockman: Contending Visions of the Middle East ( the history and politics of Oreintalism), University press new York.

**20.** A.L.. Macfie: Orientalism, first bublish. UK. 2002

**21.** Samuel P. Huntington: the clash of civilizations and the remark of world order, penguin books, first edition, Delhi, India, 1997. Page 32.

**22.** Rechard, L, Nisbett: The geography of thought (how Asian and westerner differently why ),New york 2003.

**23.** Alastair Bonnett: The idea of the West (culture, politics and history), London, 2004

**24.** Elena Andreeva , Russia and Iran in the great game(travelogoues and oreintalism), first publish U. S. A, 2007.

**25.** Ziauddin Sardar: orientalism, first edition, Raj press, New Delhi, 2002.

**26.** S.R.Myneni: Indian history(f0r pre-law first year), Delhi, published by Allahabad Law agency, second edition, India , reprint 2008.page 28

**27.** Shireen T. Hunter Editr: Reformest voices of Islam, (mediating Islam and modernity) first edition, new Delhi, India 2009

❖ ***سەرچاوە فارسییەکان:***

٢٨. دکتر محمد دسوقی: (سیر تاریخی و ارزیابی شرق أندیشه شناسی)، ترجمة: دکتر محمود رضا افتخار زاده، تهران، چاپخانه، طلوع ازادی، چاپ أول، ١٣٧٦.

٢٩. أزاده شاهمیری: (نچریه و نقد پسا استعماری)، تهران، چاپ اول، چاپ ڕامین، سال ١٣٨٩.

❖ ***ڕۆژنامە و گۆڤارەکان:***

٣٠. گۆڤاری هەژان، ژمارە ١٤و ١٥، ٢٠٠٤.

٣١. گۆڤاری کۆچ، ژمارە ٧و٨، ساڵی ٢٠٠٨

٣٢. گۆڤاری کۆچ، ژمارە ١١و ١٢، ساڵی ٢٠٠٩.
٣٣. رۆژنامەی چاودێر، ژمارە ١٩٢، دوشەممە ٢٠١٤/٣/١٧.